


# شەوانی دوگردکان

## چیرۆکی فۆلکلۆری






ئاواز دزەیی




**وەزارەتی رۆشنبیری**
**بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی رۆشنبیری و هونەر**
**ت: ٢٢٣٠٢٧٣ ـ ٢٢٦١٥٩٧**

- کتێب : شەوانی دوگردکان
- زنجیرەی کتێب : (١٩٣)
- نووسەر : ئاواز دزەیی
- چاپ : یەکەم
- ژمارەی سپاردن بەکتێبخانەی نیشتمانیی کوردستان : (٩٧) ساڵی ٢٠٠٥
- هونەرکاری بەرگ: جەلیل محەمەد
- هونەرکاری ناوەڕۆک : هاوکار حەمەد
- سەرپەرشتی چاپ : محەمەد سەعید
- چاپ : بەڕێوەبەرایەتیی چاپخانەی رۆشنبیری/ هەولێر
- تیراژ : ١٠٠٠ دانە
- نرخ : ٧٥٠ دینار

# پێشەکی

کولتوور ، یەکێك لە مەرج و ماکە ئێتنیکیە هەرەگرنگەکانی نەتەوەیە .. هەر نەتەوەیە و کولتووری خۆی هەیە، کە سیما و تایبەتمەندییەکانی ئەو نەتەوەیەی گرتوونەتە خۆ .
کولتووریش هەمیشە دوو لایەنمان هەیە : لایەنی مادی و لایەنی مەعنەوی (( روحی ))
لایەنی ماددی بریتییە لە هەموو ئەو شت و کەل و پەل و ئامێر و (( تەکنۆلۆژیا )) یەی پێداویستی ژیانی رۆژانەی ئەندامانی نەتەوەکەی پێ دابین دەبێ ، وەکو خۆراك ، جل و بەرگ ، خانوو ، کەل و پەلی ناو ماڵ ، ئامێرەکانی کارکردن ، چەك ، خشڵ ، ئامێری مۆسیقا ... ، لایەنی مەعنەویش بریتییە لە : داب و نەریت ، ئایین ، فۆلکلۆر ، پرسە جەژن ... هتد هەموو ئەم توخمە کولتووریانە ، لە ماوەیەکی مێژوویی دوور و درێژدا ، یەکەیەکی توند و رەگ داکوتراو پێکدێنن و شێوازێکی تایبەتی ژیانی ئەندامانی نەتەوەکە دادەرێژن . بۆیەش دەگوترێ کولتوور واتە شێوازی ژیان ، جا لە بەر ئەوەش کە کولتور هەمیشە نەتەوەییە ، بۆیە کەواتە ژیانیش هەر دەبێ نەتەوەیی بێت .
لێرەدا ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ، لایەنی مەعنەویی کولتوورە و بە تایبەتیش توخمێکی گرنگی کە ئەویش فۆلکلۆرە، لە فۆلکلۆریشدا چیرۆك و داستان و ئەفسانەیە کە ناوەرۆکی کتێبی بەردەستتان (( شەوانی دوگردکان )) پێکدێنن . ئەگەر سەرنجی ناوەرۆکی چیرۆکێکی فۆلکلۆری بدەین دەردەکەوێت کە ئەگەر چی هەمیشە مێژووییە ، دێرینە بەڵام دیار نییە بەرهەمی چ رۆژگارێکە ، کۆنی و دێرینیش بەر لە هەر شتێك لە شێوازی دارشتنی ناوەرۆکەکەی دەردەکەوێت کە تیایدا فیکرو لۆژیکی پڕ لە خەیاڵ و میتۆلۆژایا زاڵەو سادە و ساکاریی زۆری پێوە دیارە . ئەوەش رەنگدانەوەی فیکر و باوەڕی رۆژگارەکەیە . لە گەڵ ئەوەشدا ، ناوەرۆکەکەی پڕە لە دەربڕین و جەختکردنەوە

ئه سەر بەها کۆمەلأیەتیەکانی وەکو : پیاوەتی ، جوامێری ، میوانپەروەری و ڕێزگرتن و خۆشەویستی ، هەروەها بیرۆکەی زۆرانبازیی نێوان چاکە و خراپە ، دەسەلأتدار و بێ دەسەلأت جێگەی سەرەکیی لە چیرۆکەکەدا گرتووە، کە بە شێوازی ئەفسانەیی جۆراو جۆر دەردەکەوێ و ئەنجامەکەشی هەمیشە پۆزەتیڤە ، واتە چاکە سەردەکەوێ ...

بۆیە چیرۆکی فۆلکلۆری تا بلێی سەرچاوەیەکی بە نرخە بۆ لێکۆلێنەوە لە سەر گەلێ لایەنی مێژوویی نەتەوەیەك و پێش هەموو شتێکیش بۆ گەیشتن بەو زەمینە مێژووییەی کە شێوازی بیرکردنەوەی ئێستاکەی نەتەوەکەی لێ بەرهەم هاتووە . ئەوەش بێگومان گرنگی و بایەخی زانستیی خۆی هەیە و ، ڕەنگە ، هیچ نەتەوەیەکیش بەڕادەی کورد پێویستی بە ئاشنابوون بەو پاشنمان و زەمینە مێژووییە نەبێت ، ئەویش بۆ خۆسەلماندن خۆ نواندن و خۆ پێگەیاندن . بۆیە ئەم جۆرە سەرچاوانە دەبێ بپارێزرین و سوودیان لێ وەربگیرێ جا نووسەری دەست ڕەنگین (( شەوانی دو گردکان )) جوامێرانە بەم ئەرکە پیرۆزە هەستاوە بانگهێشتی پسپۆر و شارەزا و رۆشنبیران دەکات بۆ کەلك وەرگرتن لە بەرهەمی شەونخوونی و ماندووبوونی ...

نووسینەوەی ئەم چیرۆکانە بە شێوەزاری دزەییاتی تام و چێژێکی تایبەتی بەم بەرهەمە بە پێزە بە خشیوە ... دەستخۆشی لێ دەکەین و هیوای بەردەوامبوونی دەخوازین .

پووش پەڕ ______ هەوشاد میران ______ ٢٠٠٤

هەولێر

# قاقۆڵ زێڕو قاقۆڵ زیو

هەبوو نەبوو کەس لە خوداگەورەتر نەبوو ، کەس لە بەندە درۆزنتر نەبوو . پاشایەك هەبوو دوو ژنی هینابوو منداریان نەدەبوو . ژنەکان ناویان ئایشەو ئامینە بوو . پاشا ژنەکی دیکەی هێنا ناوی خانێ بوو بەشکو خوا ئاوڕەکی لێبداتەوە. چەند مانگەکی پێچوو خانێ زگی بوو پاشا لە خۆشیان خێرەکی زۆری کرد، نۆ مانگە تەواو بوو رۆژەك پاشا مەیلی راوێی کرد ، گۆتییە خزمەتکاران تاژییان رست کەن، ئەسپان حازرکەن ، بچینە راوێ خزمەتکار حازر بوون لە گەر پاشای چوونە ڕاوێ — برادەرەکی پاشا ناوی (میران بەگ) بوو لە ڕاوێ تووشی پاشای بوو لە ئەسپەکەی دابەزین و دەستیان لە ملی یەککردو گۆتی : دەبێ ئەو شەو بچینە مارێمە مێوانی من بی، پاشا گۆتی: باشە بەرام دەبێ قاسیدەك بچیتەوە خەبەری مارێ بدا. گۆتیان باشە خزمەتکارەکیان ناردەوە چوو بە ژنەکانی پاشای گۆت ئەو شەو پاشا مێوانی (( میران بەگییە )) نایێتەوە چاوەرێی مەبن ، ئایشەو ئامینە زۆریان پێ خۆش بوو چونکە خانێ منداری دەبوو ، هەتا تەگبیرەکی لێبکەن مامانیان هێنا شەوێ خانێ جمکەکی بوو، جمکەکە کیژەك و کورەك بوو . مووی سەریان دەبریقاوە وەکی زێڕو زیو . پیرێژنە جادوکەری مامان گۆتی : ئایشەو ئامینە بابانتان خرابیچ کوری قاقۆل زیوە و کیژی قاقۆڵ زێڕە. هەردووك گۆتیان ئەوجا ئەوە بە توو دەکرێ تەگبیرەکی بکە . مامان دەرمانەکی بێهوشی دا خانێ هەتا ئاگای لە خۆ نەمینێ . ئەوجا سندووقەکی داریان هێنا هەردوو منداریان لە ناو دانا سەریان بزمار کوت کرد، پێریژن بردی بەزێی دادا پارەو لیرەکی باشی وەرگرت گوجیلە سەگەکی هینا لە تەنیشت خانێ دانا، کە خانێ هۆشی هاتەبەر پرسی ؟ ئەرێ پلکێ

منداره‌كه كیژه یان كوڕه ؟ گوتی : دەوس بە كچەتیم گوجیلە سەگت بووە خانێ دەستی كرد بە گریان و گۆتی ئەی قوڕم بەسەر لە خۆم بەخت ڕەشێ سەربەهەشێ . لە دنیا بێ بەشێ ... خەبەریان لۆ پاشای هەنارد بێتەوە ، پاشا گۆتی : دەبێ چ قەوما بێ لە دووم هاتینە ، وەكی گەڕاوە دیتی خەركی شاری هەموو عێدز دانشیتینە، گۆتی ئەوە لۆ وەها عێدزن ؟ كەس دەنگی نەكرد . بە تووڕەیی چۆوە مارێ . ژنەكانیش وا دەستیان لە چۆكیان وەرینایە . خانێش وا لە ناو جێی دەگرییێ . گۆتی ها خانە ئەوە دەگرییێ دیارە منداره‌كەت مردییە ؟ ئامینەو ئایشە بە جۆتە ڕاست بوونەوەو گۆتیان : پاشا چیت لێ بشارینەوە . خانێ گوجیلەكی بووە بەمە ڕازی نەبووی مندارمان نەبوو، هەتا خوا ئەوەی پێ پیشان دای. پاشا لە خەفەتان سۆر هەرگەڕا و تووڕە بوو ، هاواری كرد خزمەتكار وەرن ، خزمەتكار هاتن گوتیان فەرموو گەورەم گوتێ : بڕۆن حوشترەكی سەر بڕن كەوری كەن . خانێ لە ناو كەورە حوشتری بنێن لە بەر دەركەی حەوشەی فرێێ بدەن هەر تف و لەعنەتی بكەن. خزمەتكار بە قسەی پاشایان كرد، بەرام هەموو رۆژێ بە دزی پارچە نانەك و جامە ئاوەكیان دەدایێ لە ناو پێستە حوشتری دەیخواردو دەینارانـد . كافری پێ موسرمان دەبوو . ئەوجا بێینەوە سەر باسی سندووقە دارەكە" سندووق بە ئەمری خوای سەراو بوو لە سەر ئاوێ دەڕۆیی هەتا لە بەردەكی گیربوو، لە رۆخی زێیەكە پیاوەك لەوێ حازر بوو سندووقەكەی گرتەوە، وەكی سەری سندووقەكەی كردەوە دوو منداری ساوای زۆر جوانی تێدایە، هەردووكی لە بن دارەكی دانان ئەو پیاوە حەزرەتی سولەیمان بوو . هەموو رۆژی مامزە كێویەك دەهات خۆی لە سەر ئەو دوو منداره دادەیناو تێر شیری دەكردن ، هەتا گەورە بوون حەزرەتی سولەیمان هەموو رۆژی جارەك سەری لێدەدان، فێری دەكردن كوو ئیش بكەن و چشت دروست بكەن . خواردنی خۆش بكەن و بخۆن، هەردووك گەورە بوون و جاحێر بوون ، بە قودەرتی خودای ئەو عەردەی خۆیان لێ بشوشتایە دەبووە زێڕ زیو . حەزرەتی سولەیمان فێری كردن كە خانوی

دروست بکەن . قەسرەکیان دروست کرد خشتەك لە زێڕو یەك لە زیو . قەسرەکی وا لـە قەسری هەموو پاشایان خـۆش و جـوان و درگیرتربـوو، لـە دوورەوە شـەوقی دەداوە ئـەو کەسەی دەیدیت عاجباتی پێدەهات و سەری سورِ دەما . کورِەکە ناوی (میرزا موحەمەد ) بوو کێژەکە ناوی ( گورەندام ) حەزرەتی سولەیمان بە خۆی ناوی لێنابوون ...

رۆژەك لە رۆژان دوازدە سواری لاو چاك رێککەوتن گۆتیان با بچین ئـەو شـەوقەی تـاقی بکەینەوە، پێیان لە رکێب ناو رۆیشتن هەتا گەیشتنە قەسری زێر. شـەوقی قەسـرەکە لـە چاوی دان و نەیانـدەزانی تەماشـای کێنـدەرو چ کـەرخی قەسـرەکە بکـەن، هـەر دیـوارو قولینچکەکی لەوی دی جوان و بە رەونەقە تر بـوو . هـەموویان پێکـەوە قەراریانـدا کـە ببنە خزمەتکاری سـاحێبی ئـەو قەسـرە جوانـە، چـوون لـە دەرکـەیان دا مـیرزا محەمـەد دەرکەی کردەوە دیتی دوازدە سوار لە دەرکەی راوەستاینە ، سەلامیان لێ وەرگرتنەوە بە خێر هاتنی کردن گۆتی : فەرموون وەرنە ژورێ ئـەوانێش گۆتیـان ، ئەمـە هاتینـە ئێـرە دەبینـە خزمـەتکاری ئـەو قەسرەو سـاحێبەکەی . مـیرزا گـۆتی : ئـەمن سـاحێبی ئـەو قەسرەیە و لەگەر تاقە خوشکەکم دەژیم ئەنگۆ بـرای مـنن زۆر زۆر مـەمنونتان دەبم لـە گەر من ببنە براو پێکەوە ژیان دەبەینە سەر. هەر دوولا رازی بوون و، پێکهـاتن. مـیرزا موحەمەد هەموو رۆژێ لەگەر ئـەو سـوارانە دەچـوونە راوێ بـە خۆشـی رایـان دەبـوارد. گوڵەندامیش لە قەسری زێڕو زیوو دەهات و دەچوو خواردنی لـۆ دروسـت دەکـردن... بـا بێینەوە مارێ پاشـای ... پاشـا بـەرەو پیری دەرۆیـی، خـانێ لـە نـاو پیسـتە حوشتری بۆگەنی بە عاستەم نووزەی دەهات ئایشەو ئامینەش لە کەیف و سەیفێ دا بـوون بـەهار داهات چووە گەشت و سەیرانان رۆژەکی گۆتیانە ژنی خزمـەتکاران خۆتان حـازر بکـەن، خواردن ببەن، مێوژو گێزو داندۆك لە نـاو گیـاو گـۆرێ لـە گـەر ژنـان بچـینە سـەیرانێ. هەموویان خڕبوونەوە لە ناو حاجیلەو بەیبونەی دانیشـتن ، دەسـتیان بـە قسـەی خـۆش و قاقای پێکەنین رۆژە رێیەك دەرۆیی ، لە کنیان وابوو نەبایە نە بارانە ... دووربینیان لـە

گەر خۆیان بر دبوو ، هەتا تەماشای دنیایێ بکەن . ئایشە دوور بینی دا بەر چاوی خۆی شەوقەك هاتە بەرچاوی گۆتیە ئامینەی وەرە تەماشا بکە بزانە ئەوە چییە ؟ ئەویش دەستی دا دوربینی گۆتی .. سەرم لەو بریق و باقەی سورمایە ! دەبی ئەو شەوقە چ بی؟ لەو چۆلەوانیەی. ئایشە گۆتی :
خوشکم درم داخورپا هەردووکیان گۆتیان ... با پیاوەکی بە دزی بنێرین بزانین ئەوە چییە ؟ پیاوەکیان نارد بە شوون ئەو شەوقە. پیاوە رۆیشت هەتا گەیشتە قەسری زێرو زیو . کە چاوی پێکەت لە سەر جوانی و عەنتیکەیی قسەی دەمەك لۆ نەهات ..
خزمەتکارەکی میرزای دیتی وا پیاوەك راوەستایە لێی چووە پێش و گۆتی : هۆ کابرا ئەتوو چی لێرە ؟ گۆتی : ئەمن هاتیمە بزانم ئەو قەسرە خۆشە هی کێیە ؟ خزمەتکارەکە گۆتی: ئەوە قەسری پاشای مەیە ناوی ( میرزا محەمەدە ) پیاوەکە گەڕاوە خەبەری بە ئایشەو ئامینە راگەیاند گۆتی : قەسرەکە لە زێڕو زیوی دروست کرایە ئەوانیش هەردووکیان تەماشای یەکیان کردو دریان کەتە قرت و قرتێ . گۆتیان . با تەگبیرەکی بکەین پیرێژنی مامانی سەر ئاسنی جادوکەر هەرمابوو چوونە کنی پێیان گۆ . وەرە عیلاجەکمان لێ بکە . دەرێن قەسرەکی زێڕو زیوو . دروست کرایە لە چۆلەوانیەکی دوازدە سوارو پاشایەك لێ دەژی ، ئەوجا نازانین ئەو پاشایە مارو منداری هەیە یان نا .
پیرێژن گۆتی خەمتان نەبی ئەوە هەر بە من دەکرێ . کەرۆکەکم لۆ پەیدا بکەن بە سواری کەرێ دەچم . سواری کەرێ بوو رۆیی بە شوون شەوقێ داچوو هەتا گەیشتێ . چاوی بە قەسرێ کەت چاوی چووە پشتی سەری . گۆتی : ئەوە کوو دروست کرایە ؟لە پشت دیواری گاسی کرد . هۆی خەنە هۆی نبیشت ، هۆی زەنگیانە، گوڵەندام ، گوێی لە دەنگی پیرێژنی بوو گۆتی : خودایە ئەوە چی‌یە ؟ئەو دەنگە دەنگە ، قەت گێم لە دەنگی وەها نەبووە. پەنجەرەی کردەوە دیتی لە بن دیواری پیرێژنەکی ناشرین راوەستایە .. پیرێژن سەری برند کرد چاوی بە کێژەی کەت جوانی وەهای قەت نەدیتبو پرچی بریق

و باقیتی گاسی کرد هۆ هۆ کیژە جوان ناوت چیە ؟ گۆتی ناوم گوڵەندامە ئەدی داك و بابت ناویان چیە ؟ ئەویش گۆتی داك و بابم نییە هەر برایەکم هەیە ئەویش چوویتە ڕاویّ. پیرێژن گۆتی : دەرکەی بکەوە بێمە ژوریّ . گۆتیّ : ئەمن ناوێرم دەرکەی بکەمەوە ، کاکم پێی ناخۆشە . گۆتی : دەباشە ، وەکی کاکت هاتەوە بریّ هێسکی نەهەنگانت لۆ پەیدا بکا خانیەکەتان چەند خۆش و بەشەوقە هەندەی دی خۆشترو بە شەوقتر دەبیّ . هێسکەکەی لە دیواری بدە . پیرێژن سواری کەریّ بوو گەڕاوە کن ئامینە و ئایشە ، ئەو خەبەری دانیّ گۆتی هەبی و نەبی هەر مندارەکانی خانێە وەکی هاویشتمانە زێی داخوا چ سەگ بابەك سندوقی لە سەر ناویّ گرتیتەوە دەبیّ هەر بیان فەوتێنم هەتا پاشا نەیزانییە . هەر سیّ کیان لە خەمان وەخت بوو بتەقن ... میرزا لە راویّ هاتەوە چووەکن خوشکی دیتی خوشك بە کزی دانیشتیە لێی پرسی خوشکیّ لۆ وەها عێدزی ؟ گۆتی کاکە چشتەکم دەویّ دەبی لۆم پەیدا بکەی، گۆتی خوشکم بە سەرچاو با بزانم ئەوەچییە ؟ گۆتی هێسکی نەهەنگانە، گۆتی خوشکم ئەوەت لە کیّ زانییە؟ دەبی یەکەك پێی گۆتبی، کەس پێی نەگۆتیمە بە خۆم هاتە خەیارم گۆتی : درت ناشکێنم وا دەچم بزانم لە کیّ پەیدا دەبی بەرام ئەتو زۆر ئاگات لە خۆبی دەرکەی لە کەس نەکەیەوە، گۆتی باشە میرزا شەش سواری لە گەر خۆی بردو رۆییّ سیّ شەوان بەرێوە بوون، زۆر ماندی، بوون نەیان دەزانی بچنە کیّ ؟ دانیشت میرزا لە بەر خودای پاراوە گۆتی : خوایە ڕەحمەکم پیّ بکەی لەو ئیشە قوتارم بکەی، لە پڕ حەزرەتی سولەیمان لۆی پەیدابوو گۆتی : ها میرزا لۆ کیّ دەچی ؟ میرزا گۆتیّ : گەورەم تاقە خوشك دەعوای هێسکی نەهەنگیان دەکات . ئەمنیش هاتیمە نازانم لە کیّ پەیدا دەبیّ گۆتی : کوڕم بەو ڕێیە دابڕۆ دوو سەعات ڕیّ ببڕە دەگەیە بەحرەکی سیّ شەپۆڵەی گەورەی پێدا دیّ، شەپۆڵەك رەشە یەك سپییە ، یەك شێلووە وەکی شەپۆلە سپیەکە هات بە خێرایی دەستت درێژ بکە، دەست بگەینە شەپۆڵە ئاوەکە هێسکەکە دێتە ناو

دەستت، بەرام نە دەنگ بکە و نە ئاور لەو لاو لەو لای خۆت بدەوە، پێ بە غـارێ وەنـێ سواربەو هەرێ هەتا دەگەیە بەر دەرکەی مارێ خـۆت چ قسـان نەکـەی . ئەگـەر دەنـگ بکەی و ئاوڕ بدەیەوە دەکەوییە بنی بەحرێ و دەڕۆی نایێیەوە گـۆتیێ باشـە بـە تـەگبیری حەزرەتی سولەیمانی کرد . هێسکی نەهەنگی لە گەر خۆی هێناو هاتـەوە هێسـکیان لـە دیواری چەقاند، هەندەی دی مارەکەیان خۆشتر بوو . گوڵەندام گۆتیێ بە قوربانـت بم بـرام ، نەوندە خۆت ماندی کرد لە بۆ من زۆر مەمنونتم پیرێژن لە پاش ( دە) رۆژان چووە کن کیژەی، گۆتی گوڵەندام دەرکەی لە داپیرەی بکەوە بێمە ژۆرێ. گوڵەندام دەرکەی کـردەوە پیرێژن گۆتی : کیژم نەم گۆ مارتان خـۆش دەبـی چشـتەکی دی هەیـە هـەر لۆتـوو باشـە ئەگەر نەوەت هەبی قەت ئەتو عێدز نابی. چونکە ئەتو بەتەنێی. گوڵەندام گۆتی: داپیرە ئەو چشتە چیە ؟ گۆتی کێژم تەشتی نەدامیێ ، تەشتەکە بە تـەپرو مۆزیقـە و هەرایەکـە بەزمەکە هەر بەحس ناکرێ. ئەمن خەمی توومە ئەتو بەتـەنێی. ئـەوا دەرۆم کیـژم، بـە دووعا. پیرێژن رۆیی چۆوە کن ئامینە و ئایشەی، گۆتیان دەبی ئەو کوڕەی لە ناو ببـەین دەنا ئیشمان خراپ دەبی کوڕەکە بفەوتیێ کیژەکە ئاسانە، ئایشەو ئامینە گۆتیـان داپـیرە ئەو چاکەمان لە گەر بکە قـەت لـە چـاکەت دەرناچـین، هەرچـی برێـی دەت دەینـێ ...

میرزا هاتەوە دیتی خوشکی دەستی لە چۆکی وەرینایە بە عێدزی دانیشتییە گۆتی : هـا خوشکی دیسان لۆ وەها عێدزی ؟

گۆتی کاکە پێت خۆش بی و ناخۆش بی تەشتی نەدامێم دەوێ، گۆتی خوشکم ئەتو ئـەو چیشتانە لە کێ دەزانی، خۆت عێدز دەکەی؟ گۆتی ئەو چیشتانە زۆر زەحمـەتن هـەبی و نەبی ئەوە ئیشی جادوکەرانە ئەوها بە توو دەرێن. بـەرام خوشـکم درت ناشـکێنم دەچـم ئەوەشت لۆ دەینم بە تەمای خوای. میرزا هەر دوازدە سواری لە گەر خۆی بـردو رۆیشـتن خواردنیان لە گەر خۆیان برد حەفت شـەوو حـەفت رۆژ بـەرێێ وەبـوون زۆر مانـدی بـوون میرزا گۆتی : با لە جێگایەکی هەندەك دابەزین خۆمـان بحەسێنینەوە و، نانـەکی بخۆین

دانیشتن ماندی خۆیان حەساندەوە نوێژیان کردو گۆتیان بابڕۆین ... ئەوجا میرزا هاواری کرد یا حەزرەتی سولەیمان بە هانامــان وەرە. حـەزرەتی سـولەیمان حـازر بـوو. گـۆتی هـا میرزا دیسان چییە ؟ گۆتی گەورەم وەللاّ لۆ تەشتی نـەدامی هاتێمـە گوڵەنـدام دەعـوای کردییە. حەزرەتی سولەیمان گۆتی : کوڕم ئەتو خۆت لۆ وەهـا گێـل کردییـە لـە دوو ئـەو چشـتانە دەگـەڕێی هـەتا ڕۆژەك تووشـی داوی دێـوان دەبـی ، بگـەڕێوە بـەڕێی خـۆت : سەرەکەو هینایتم وە ناگەڕێمەوە ئەوجا حەزرەتی سولەیمان گۆتی با تـەگبیرەت لـۆ بکـەم ... ئەو ڕێیە باریکەی دیـارە هـەر ئـەو ڕێیـە بگـرە بـڕۆ هـەتا دەگەیتـە ئەشـکەفتەکی گەورە، لە پێش ئەشکەفتەکەی بیست سواری لێیە هەر بیست بووینە بەرد ئـەو سـوارانە وەکـی تـوو لـۆ ئـەو تەشـتەی چـووینە دەبـیّ لـە سـەرەخۆ بـڕۆی ، دێـوەك لـە دەرکـەی ئەشکەفتیّ نووستیە مەمکی ڕاستی لە سەر ملی چۆپەی دانایـە چـۆپەی لـە سـەر ملـی ڕاستی دانایە دەبی بچی مەمکی چۆپەی بمژی بـەبیّ ئـەوەی واگـا بـیّ لـە گـەر مـژێنی مەمکی واگا دیّ هەر چەند هاوار بکا چ قسان نەکەی و مەمکی بەرنـەدەی هـەتا پێـت دەریّ تەشتەکە لە کێیە. چونکە ئەگەر دەنگ بکەی دەبیە بـەرد هەرچـەند دێـوە قسـەی دەکا ئەتو خۆت مـات بکـە . گـۆتی باشـە . حـەزرەتی سـولەیمان ئەنگوسـتیلەکی دایـیّ گۆتی : ئەگەر ئیشەکت هەبوو ئەو ئەنگوستیلەیە بـادە ئـەمن لـۆت حـازر دەبم . مـیرزا گۆتی : مەمنون . دەستت ماچ دەکەم ڕێیە باریکەیان گرت هەتا گەیشـتنە ئەشـکەفتیّ دێوەك لە دەرکەی نووستییە دەرێی کەرتکە چیایە، میرزا بە زانایی چوو پڕی دا مەمکی دێوەی مژی ، دێوە واگا هات ، دەستی کرد بە هاوار کردن، بـۆن دیّ بـۆنی بێگانـان دیّ لەو عەردو مەکان دیّ. میرزا چ دەنگی نەکرد ئەوەندەی دێـوە قسـەی کـردو بـە تـوڕەیی هاواری کرد میرزا دەنگی نەکردو مەمکی بەرنەدا دێوەکە گۆتی ، دیارە ئەتوو کـوڕەکی زۆر ئازای کەس بە من نەوێرایە . ئەتو کوو گەیشتییە ئێرە ، کـوڕی بـاش بـەو مـەمکم بەردە دەبخوازە ماری دنیایێ میرزا هەر قسەی نـەکرد و ئـەوجا دێـوە پێـی گـۆ بـڕۆ نـاو

ئەشکەفتی تەشتەکە وا لەوێ دانرایە لە سەرەخۆ دەست بدێ بفرێنەو هەرێ. بەرام چ ئاوران نەدەیەوە ئەخۆت ئەسوارەکان یەکتان ئاوڕ نەدەنەوە دەنا هەمووتان دەبنە بەرد. ئەویش چوو بە قسەی کردو تەشتەکەی لە سەر ملی خۆی دانا و هەرات، گۆتییە سوارەکان کەس ئاوڕ لەو لاو لەولای خۆی نەداتەوە هەتا گەیشتنەوە ماڕێ ماندی خۆیان حەساندەوەو، نانیان خوارد. ئەوجا ئیوارێ تەشتیان هینا لە ناوەراستی ماڕێ دایان نا دەستی بە بەزمەکی کرد هەراو مۆسیقە لێدان وەکی سینەمەکی بوو، خوشکەکەی لە خۆشیان خەنی بوون ... پیرێژن هاتەوە دەبینی وا تەشت هاتییە هەر وەخت بوو هاربی گۆتی : ئەیەرۆ ئەو کوڕە چییە ؟ وەها بە ئاسانی ئەو چشتانە دەینی . با ئەو جارە برێم ئەدامێ بینی بەشکو دەچی نایێتەوە ئەگەر هاتەوە ئەو جارە دەرمان خواردی دەکەم. چ چارەی دی نییە گۆتی : کیژم گوڵەندام بزانە لۆ قازانجی تووم بوو ئەو جارە برێ کاکەی ئەدامی بینی، ئەدام کیژەکە زۆر جوانە کاکت لۆ خۆی بینی لە گەرت دەبی لە ماڕێ قەت عێذز نابی. گوڵەندام گۆتی : داپیرە ئەتوو لۆ من بوویە فریشتە زۆر مەمنوون هەندەك پارەی دایێ، پیرێژن رۆیی. میرزا هاتەوە گوڵەندام گۆتی : کاکە بە خوای دەبی ژنی بینی بەشکو دوو مندارۆکەت دەبی لۆ خۆمان زۆر دەبین گۆتی : باشە کێ بینم دەبی ئەتو هاوسەری لۆ من بینیەوە ئەگەر ئەتوو رازی نەبی ئەمن بە خۆم کەس نارێم. گۆتی : دەبی ساحێبی تەشتی ناوی ئەدامە دەرێن کیژەکی گەلە جوانە میرزا گۆتی : خوشکم ئەتوو چشتی هەندگران دەرێی باشە ئەتوو لە کێ دەزانێ کیژەکە جوانە ؟ ئەمن ئەوەندە ماندی دەکەی لە بەر دری توو ئەبا ئەو تەشتەم کو پێ دەهات، بەرام درم ئەشکاندی. گۆتی کاکە شەرتت لەگەر دەکەم ئەو جارە بە قسەم بکە چیدی دەعوای چ ئەکەم. کاك رازی بوو گۆتی : ئەو جارە بە تەنێ دەچم میرزارۆیی کەسی لە گەر خۆی ئەبرد پێنچ رۆژان بە تاقە سوارە لە رێی بوو ئەوجا هاتەوە بیری، ئەنگوستیلەی حەزرەتی سولەیمانی گرت و بای دا ..حەزرەتی سولەیمان حازربوو، گۆتی: ها، میرزا

دیسان لۆ چ هاتی؟ گۆتی :گەورەم لۆ ئەدامیّ هاتیمەو ناگەرێمەوە ئەو جارە شەرتم لە گەر خوشکم کردییە . دوا جارە ئەگەر سەری خۆم لە سەر دانابی. ئەویش گۆتی : وا ئەو جارەش تەگبیرت لۆ دەکەم بەو شەرتەی چیدی خۆت تیّ ناگەینم . گۆتی : باشە گەورەم بە سەر چاو شەرتت لەگەر دەکەم ئەو جارە دوا جاربی ئەگەر تیّ بچم و دەربچم. حەزرەتی سولەیمان گۆتی : ئەو ئەشکەفتەی تەشتی ئەدامیّت لیّ هێنا، رێی ئەویّ بگرە هەتا دەگەیە دەرکەی ئەشکەفتیّ، دیسان دێوەکە نووستییە ئەو دێوەی بکوژە ئەوجا هەتا دەنگت تێدایە گاسی بکە ئەدام سیّ جار هاوار بکە ئەگەر ئەدام لەگەر دەنگت واگا هات، ئەوە باشەو دەبیتە ئی توو ... ئەگەر واگا نەهات ئەوە ئەتووش دەبییە بەرد وەکی ئەو بیست سوارەی لەویّ بووینە بەرد. میرزا رۆیی هەتا گەیشتە دەرکەی ئەشکەفتیّ، دیتی دێوە نوستییە شیرەکی لە ناو قەدی داو کردییە دوو پارچە. لەگەر کوشتنی دێوەکە عەرد لەرزی، ئەوجا میرزا هاواری کرد هۆ هۆ ئەدام هەر چار پەلی ئەسپەکەی بووە بەرد زۆر ترسا لە دری خۆی گۆتی : ئەوجا ری تیّ بچم ئەو جارەیە. ناوی خوای لیّ هێناو هاواری کرد یا حەزرەتی سولەیمان هۆ هۆ ئەدام ئەدام، بە دەنگەکی برند ئەدام گۆتی لە بەیکە ئەو بیست سوارەی ببونە بەرد لەگەر واگا هاتنی ئەدام تێکرا چاك بوونەوە. توومەز ئەدام بە سیحری دێوان نووستبوو، کیژدك بوو ئەبکەی ئەبخۆی هەر تەماشای بکەی ئەوەندە زەردو تەنك بوو مێوژی ڕەشی لە گەردەنی دیاربوو. کە میرزا چاوی پیّ کەوت دەم و دەست عەشقی بوو. ئەدام گۆتی : بخوازە ماری دنیایێ، چەند سارە لێرە بەدیل گیرایمە بە سیحری دێوان چونکە مێردم بە دێوان نەکرد، ئەوانیش بە جادوو کردنیّ ئەمنیان نواند. ئەو بیست سوارە لاوەش لە بۆ من هاتینە چیییان پیّ نەکرایەو بووینە بەرد. میرزا گۆتی : ئەمن لۆ ماری دنیایێ نەهاتیمە لە بۆ توو هاتیمەو ناگەرێمەوە. ئەدام گۆتی : هەر چی ئەتوو برێی حازرم. ئەگەر سەریشم ببڕی رازیمە، بەرام دەبی هەتا چل رۆژ لە سەرم ڕاوەستی و هەر چی گۆتم بە قسەم بکەی ئەوجا مێردت پیّ

دەكەم. میرزا گۆتی : بە سەر چاو گێ لە قسەی تـوو دەگـرم بیسـت سـوارەكەش گۆتیـان ئەمەش دەبینە خزمەتكاری تو ئەگەر لە بەر تو نـەبا هـەتا هەتایـە چـاك نەدەبووینـەوە رێك كەوتن هەموویان بارگەو بارخانەیان تێكنا چەند زێرو دووڕو مەرجانی دێوان هـەبوو دەستیان پێ داهیناو، باریان كردو بەڕێ كەتن . نـەدام گوجیلـەكی هـەبوو لەگـەر خـۆی هیناو گۆتی : گێتان لێ بی ئەو گوجیلە بە كێ‌دا رۆیی رێی وێ بگرن و لـە دووی بـڕۆن، گۆتیان باشە. گولەندام هەر هاتوو چۆی دەكرد دری توند ببـوو چـاوەرێی كـاكی دەكـرد، هەر دەیگۆ ئەی هاوار چم كرد لە پڕ بووە غەربە غـەرب و دەنگـە دەنـگ خزمـەتكارەك بـە غـار چـووە كـن گوڵەنـدامێ گـۆتی : مزگێنـی گـەورەمان وا گەیشـتە جـێ كۆمـەرە سوارەكی لە گەرە. وەكی هاتنە پێش و گەیشتنە بەر دەركـەی قەسـرێ گوڵەنـدام و دارو دەستەی خۆی بە پیری وە چوون گوڵەندام لە خۆشیان دەگریا دەستیان لە ملی یەك كـردو بوو بە شاییو هەراو بەزم ئەوجا نـەدام گـۆتی : زۆر هـیلاكین و برسـین بـا نانـەكی حـازر بكەین، بدەینە ئەو سوارانە. بەشكو دەچنەوە وراتی خۆیان چەند سـارە داك و بابیـان لـە دریان بوویتە حەسرەت سوارەكان گۆتیان ئەمە هەر ئەوەنـدە دەچین سـەریان لێ دەدەیـن بزانین كێ مایە كێ مردییە، چەند رۆژەكمـان پـێ دەچـی دێینـەوە كـن تـوو لێـرە خـانی دەكەین، هەتا دەمرین هەر خزمەتكارین ... میرزا گۆتی : برۆن كەس و كارتان بەسـەر بكەنەوەو وەرنەوە ئەمـە هـەر بـرای یـەكین پێكـەوە رادەبـوێرین . هـەر رۆژێ شـایی لـۆ یەكەكمان دەگێرین ... ئەوجا سەرتان نەیەشی با بێنەوە مارێ پاشای. بابی قاقۆل زێڕی پاشا پیر بوو زۆر عێدز دانیشتبوو لە دری خۆی گۆتی : ئای خۆ پیربووم و بە وجاغ كۆری دەمرم پاشا خزمەتكاری گاس كرد گۆتی : ئەسپەكم لۆ زین كـەن دووربینـەكم لـۆ بیـنن هەندەك دەچمە گەڕانێ، خزمەتكار ئەسپی لۆ پاشای هینـا و سـوار بـوو جـەرەوەیان لـۆ راكێشا لە ناو شاری گەڕان و چوونە سەر قەراتێ . پاشـا دووربینـی دا بـەر چـاوی خـۆی تەماشای دنیا پێی‌كرد، شەوقەكی هاتە بەرچاوی بریقەی دەهات سەری سـوڕما گـۆتی :

خوایه دەبی ئەوە چ بی ؟ بایەکەکی بنێرم بزانین ئەوە چییە ؟ مام باپیری گاسکرد گۆتی: وەرە دوربینی بدە بەرچاوت بزانە ئەو شەوقە چییە ؟ لە کێ دیارە بە شوون ئەوەی دابـڕۆ خەبەرم لۆ بینەوە. مام باپیر بە شوون شەوقی دا چوو هەتا گەیشتە قەسرێ زێڕ . وەکـی چاوی بە قەسـرێ کـەت، نـەی دەزانـی تەماشـای چ بکـا چـەند سـواری لاو چـاك و قـۆز رمبازیان دەکرد، سوار سوارانێ دەکەن لە بەر دەرکـەی قەسـرێ چـووە پـێش و سـەلامی کردو پرسی ؟ ئەرێ ئەو جێو قەسرە ئی کێیە ؟ سوارەکان گۆتیـان مامـە ئـەوە قەسـرێ (میرزا محەمەد) یـیە پاشای مەیە مام باپیر گەڕاوە ئـەو خەبـەرەی لـۆ پاشـای خـۆی بـرد گۆتی : پاشام خۆش بی قەت چشتی ئەوهام نەدیتییە لە ناو چ پاشایان نەبووەو نەکرایە. پاشا گوتییە مام باپیری برۆ کن ئەو میزایەی برێ پاشام دێتە مێوانـت دەیـەوێ بتناسـی مام باپیر چوو بە سـواری لـە دەرکـەی پاسـەوان ڕاوە سـتابوون سـەلامی کـرد و گـۆتی : دەمەوێ پاشـاتان ببیـنم. پاسـەوان خەبـەری بـرد گـۆتی : گـەورەم پیـاوەکی بێگانـە لـە دەرکەیە دەیەوێ بێتە خزمەتت ئەویش گۆتی بـرێ بفـەرمووی. مـام بـاپیر هاتـە ژورێ و سەلامی کـرد مـیرزا لەبـەری هەسـتاو بـە گـەرمی سـەلامی لێ وەرگرتـەوە. مـام بـاپیر دەمەك حەپەسابوو نەی دەزانی چ برێ، هەر تەماشای میرزای دەکرد هەند کورەکی قۆزو جوان و قسە خۆش بـوو گـۆتی : گـەورەم پاشـامان ئـەمنی ناردییەکـە خەبـەرت بـدەمێ سبەینێ دێتە مێوانت حەز دەکا بتناسی. میرزا چوو پرسی بە نەدامێ کرد . نەدام گۆتی ڕاوەستە با دوو قسەی لە گەر بکەم، نەدام بـە خێـر هـاتنی مـام بـاپیری کـرد پیرەمێـرد چاوی بە نەدامێ کەت وەخت بوو شێت بی. لە دری خۆی گۆتی : خوایە ئەوانە چنە جنن ، پەرینە ئـەوجا نـەدام لێـی پرسـی مامـە پاشـات نـاوی چـیە ؟ ئـەویش گـۆتی : نـاوی (مەحمود میرزایە) نەدام گـۆتی : مامـە بـرۆ خەبـەر بـدە پاشـات بـا نەزیـەت نەکێشـی سبەینێ میرزا محەمەد بە خۆی و بە دوازدە سواری دەبیتە مێوانی وی. مـام بـاپیر زۆری پێ خۆش بوو ئەو خەبەرەی لۆ پاشای بردەوە پاشا گـۆتی : دیوەخـانێ بـاش ڕێـك بـێخین

کاوران سەر برن، خواردنی باش دروست بکەن، ئەوجا ئەدام گۆتیـە : مـیرزای دەبـی ئـەو گوجیلەی لە گەر خۆت ببەی چ تەگبیرەکی ئەمن لۆت دەکەم بە قسەم دەکـەی. مـیرزا و گوجیلەو دوازدە سوارە حازر بوون پێش ئەوەی بەرێ بکەون ئەدام چاردە دەسـکە گـوری بەست دەسکەکی لە ملی گوجیلەی بەست یـەکی دایـە مـیرزای هـەر سـوارە دەسـکەکی دایێ، پێی گۆتن ئەو گوجیلەیە بە کێ دا رۆیی ئەو رێی ئەو رێی بگرن، ئەو گورەی لـە کـێ دانـا ئەنگۆش لەوێ دابنیشین، هەتا خواردن گوجیلە بۆن بکا ئەوجا بخۆن، گۆتیان باشە ئـەمر دەکەی. سوار بوون و بەرێ کەتن هەتا گەیشتنە شاری ( مەحمود ) پاشای گوجیلـە رێـی دیوەخانی نەگرت و رێی مارێ داچوو، خزمەتکار بە پیریان وەهـاتن گۆتیـان : فـەرموون ئەو رێیە ئی دیوەخانیە پاشا چاوەرێتان دەکا ، ئەوانیش گۆتیان عادەتمان وەهایە گوجیلە بە کێ دابروا بە جێی پێی ویدا دەرۆین. گوجیلە گەیشتە بەر دەرکەی دەسکە گورەکـەی لە سەر کەورە حوشتری دانا، میرزا و سـوارەکان وەکـی ئـەوەیان دیـت سـەریان سـوڕما، بەرام ئەوانیش گورەکانیان لە سەر کەورە حوشتری دانـاو بـە بـێ ئـەوەی بـزانن چییە ؟ خەرکەکەش ئەوەیان پێ سەیر بوو ئایشەو ئامینە کە ئـەوەیان زانـی هـەر شـێت بـوون . ئەوجا پاشا بە پیر میرزای وەچوو دەستیان لـە ملـی یـەککردو، یـەکتریان مـاچ کـردو، نەشیان دەزانی باب و کورن. دانیشتن دەستیان بە قسەی خۆشکرد هەتا نـان حـازر بـوو، ئایشە و ئامینە گۆتیان : وەها باشە ژەهری لە خواردنەکە بکەین لە پێش بـاب و کـوڕی دابنێین هەر دوکیان دەمـرن و لـە کۆڕدەبنـەوە. عادەتیـان وەهـابوو دوو نەفـەر لـە سـەر سینییەك دادەنیشتن نانیان دەخوارد. شیو تێکرا لۆ دیوەخانی چوو ئەو سێنیە شیوەی لۆ پاشاو میرزای داندرابوو ژەهری تێکرابوو ئەوجا گوجیلە چوو بۆنی کردو بە جێی هێشت، لە خوارێ لە لای دەرکەی لە سەر سێنیەك هەر تروکـا مـیرزا محەمـەد چـوو لـە تەنیشـت گوجیلە چوو بۆنی کردو بە جێی هێشت لە خوارێ لە لای دەرکەی لە سەر سێنیەك هـەر تروکا. میرزا محەمەد چوو لە تەنیشت گوجیلەی دانیشت پاشـا گـۆتی : ئـەوە ئیشـە کـو

دەبێ ئەتو لە لای خوارێ دابنیشی؟ گۆتی : گەورەم خۆت ماندی مەکە لە سەر دەستوری گوجیلەی دەڕۆین. پاشاش ناچاربوو لە کنەوی دانیشت و بە جۆتە نانیان خوارد ژەهراوییەکە لە سەرێ بەجێ ماو کەس نەیخوارد. نان خوراو دەست و دەویان شوشت و، تەڕەو مێوەیان خوارد، گەلەکیان قسەی خۆش و سەیر کردو ماراوایان خواست بگەڕێنەوە. پاشا زۆری حەولدا شەوێ بمینێنەوە، میرزا گۆتی : گەورەم با لۆ جارەکی دی بی بەرام دەبێ دووسبەی بە خۆت و بە وەزیر و خزمەتکارەوە مێوانی من بن و، گەورەمان بکەن ئەویش گۆتی : باشە. بە خۆیی و بە گوجیلە و سوارەوە بە سەلامەتی گەرانەوە هەمووی لۆ نەدام و گوڵەندامیێ گێراوە ... دوو رۆژی پێچوو پاشا بە خۆی و بە پەنجا نەفەری مێوانی میرزای بوو. وەکێ گەیشتە بەر دەرکەی نەیان دەزانی کوو تەماشای بکەن و کوو بچنە ژورێ، میرزا و جەماعەتی بە پیریانەوە چوون بە گەرم و گوڕی وەریان گرتنەوەو، ئەوجا دۆیان دانێ و خورماو گوێز دەگێڕدرا لە ناو سەبەتەی زێر. نەدام و گوڵەندام خواردنیان دروست کرد کەس ئەو خواردنانەی نەدەزانیو خواردەنەکەش لە ناو قەپێلکی هێلکەی دروست کرا تامی حەفت تەعامانی لێدەهات. مەلای نیوڕانێ بانگی داو نوێژ کراو ، وەختی نان خواردن داهات، شیو تێکرا. قاپ و قاچاغ هەمووی لە زێرو زیوی دروست کرابوو هەر نەفەری سێ‌تیەکی لە پێش داندرا، کە نان خواردن تەواو بوو خزمەتکارەك هات بە دەنگەکێ برندو گەورە گۆتی : ئەی مێوانەکان خاتو نەدام دەفەرمووی هەرکەسە سێ‌تیو قاپی پێش خۆی لۆ خۆی بباو پێش کێشی بی. ئەوانیش تەماشای یەکیان کردو زۆریان پێ خۆش بوو. گۆتیان زۆر مەمنونین بەو دیارییە جوانەی خاتونێ .. پاشاش نەی دەزانی کو دەست درێژ بکا چشتەکانی زۆر پێ جوان بوو لە دری خۆی گۆتی : عەیبە لۆ من دەست درێژ بکەم . خزمەتکارەك گۆتی: گەورەم دیاری توو لەگەر ئیوان جودایە. ئەویش دەنگی نەکرد بەرە بەری رۆژئاوا پاشا گۆتی : ئەوجا کنەنگۆمان پێ خۆشەو دەگەڕێینەوە. میرزا محەمەد گۆتی : پاشام

خۆش، نابی درگران بی دەسگیرانەکەم دەرێ دەبی پاشا و دوو وەزیـرو مـام بـاپیر ئەوشـۆ لێرە بێنینەوە، سەر بردەك هەیە لۆی دەگێرامەوە ئەو دەبی بزانی پاشا گۆتی : قسـەتان لە سەر چاوم، ئەمریدا ئەوانەی لەگەری هاتبون هەموویان بچنەوە نـانی ئیـوارێ خـوراو دەستیان کرد بە قسەکردن، ئەوجا پاشا گۆتی : میرزا با دەسگیرانت بێ ئەو سەربردەمان لۆ بگێرتەوە بـزانین چییە ؟ نـەدام و گوڵەنـدام و مـیرزا پیاوەکـانی لـە گـەر مێوانـەکان دانیشتن ئەوجا هەموو بێ دەنـگ بـوون و نـەدام دەسـتی کـرد بـە گێرانـەوەی حکایـەتی (قاقۆل و زێرو قاقۆل زیو) هەتا گەیشتە میوانداری میرزاو پاشای وەکی پاشا گێی لـەو سەربردە بوو دری لە خۆیۆوە تەواوەك بێ هۆش بوو، پاشا بـە خـۆ هاتـەوە دیتـی کێـژەو کورە لەولاو لـەولای دانیشـتینە دەسـتیان لـە نـاو دەسـتی خۆیـان نایـە، کـۆری گریـانی هەستاو گریا. دەستی لە ملی هەردوکیان کرد سەری بە سینگی خۆی وە نوساندن. ڕووی لە هەموویان کردو گۆتی : قەت قەت باوڕ ناکەم ئەو کێژو کوڕە نی من بـن ئـەوە چـەند سارە بە حەزرەت مندارەکیمە ئایشەو ئامینە ئەو کەتنە گەورەیان کردییە، هەتا هەوکـە کەس نەیزانییە ئەوە چ سڕەکی وەها قایمە خانێ قوڕ بە سەر ئەو کیژو کوڕەی ببـی و لـە ناو پیستە حوشتری بمری. ئەوجا گۆتی مام باپیر بە خێرایی هەڕۆوە قەبرەکی لێدەن خانێ لە ناو کەورە وحوشتری بینە دەرێ جوان بیشۆن و بیشارنەوە. میرزا محەمـەد وەکـی گێـی لەو قسانە بـوو هـەموو مـووی بـەدەنی وەك نەشـتەر ڕاوەسـتاو بـە تـوڕەیی گـۆتی : بـا هەموویان بە تێکرایی برۆین بـە خزمـەتکارو نـەدام گوڵەنـدام و گوجیلـە و کـەس نـەما هەموویان سوار بوون و ڕۆیشتن لۆ شاری ( مەحمود پاشا ). ئایشەو ئامینە وەکی زانیان ئیش ئاشکرابوو کار لە کار ترازا، جێ نەما خۆیـان لێ بشـارنەوە. قەیسـەریان لێ بـووە کونە مشك، میرزاو گوڵەندام گەیشتنە بەر دەرکەی مـارێ بابیـان غاریـان دا سـەرکەورە حوشتری بە هەردوکیان هەریان دڕی داکیـان لـە نـاو دەرینـاو، بـە ئـەمری خـوای ڕۆحـی مابوو بە عـاستەم هەناسەی لێ دەدا، نـوزەی دەهـات. بـەرام کەلەکـەی هـەموو بۆگـەنی

ببوو، ببووه برین. نەدام و گوڵەندام لەگەر دوو ژنان خانیشیان پاك و خاوێن شوشت و، بەرگەکی باشیان لە بەرکردو، گوراویان پێداکرد. خواردنەکی گەرم و گوڕیان لە پێش دانا هەندەك هۆشی هاتەوەبەر. ئەوجا تەبیبیان هینا و چەند داوو دەرمانی لۆ کرد هەتا چاکبۆوە. خانێ دەستی بە گریانێ کرد گۆتی : چەند بەدبەخت بووم چەند روح قایم بووم دەنا ئەوەی بە سەر من هات بە سەر کەس نەهاتیە. میرزا محەمەد و گوڵەندام دەستیان لە ملی داکیان کردو، پێك شادبوونەوە. پاشا هاتە کن خانێ گۆتێ دەبی گەردەنم ئازا بکەی و لێم خۆش بی، چونکە نەمزانی ئەتوو بێگوناهی پاشا و خانێ عومریان نوو بۆوەو، بوونە پیری ئاخر خێر . ئایشەو ئامینەیان هینا لەگەر پیرێژنی سەر ئاسن لە بەر چاوی هەموو خەرکی شاری لەت و پەتیان کردن و، لە هێستراتیان بەستان و ڕایان کێشان هەموو تۆرەیان لێ کردنەوە. ئەوجا پاشا خەزێنەی شکاند کردییە خێر بە سەر فەقیرانی دابەش کرد . نەدامی لۆ میرزای گواستەوە چل شەوو چل رۆژ هەر شایی و هەرپەرکێ بوو بەزم و رەزم و چەپرە رێزان هەر مەپرسە لەو خۆشی و شادییە. ئەمنیش هاتمەوە قاپەکی زێریان نەدامێ .

# پاشاو دەروێش

هەبوو نەبوو پاشایەك هەبوو وچاغ کۆر بوو. ژنەکی زۆر هاری هەبوو، هەموو رۆژی لەگەر پاشای شەڕی دەکرد. پاشا لە دری خۆی گۆتی : با ئەو ژنەی تاقی بکەمەوە بە ژنەکەی گۆت دەچم سەرەکی لە ماریێ برام دەدەم زۆر غەریبی دەکەم لە مێژە نەم دیتییە. ژنەکەی زۆری پێ خۆش بوو. چونکە دۆستی هەبوو دەیوست لەگەریان رابوێری .. پاشا خزمەتکارەکی لەگەر خۆی بردو بە ژنەکەی گۆت دوو شەوم پێدەچی... پاشا بە سواری رۆیشت لەگەر حەمەی خزمەتکار، شاژن گۆتی بەخوا فرسەتەکی باشە چەند خزمەتکار و نۆبەداری بەر دەرکەی هەمووی ئیزن دان گۆتی : ئەنگۆش برۆنەوە ناو مارو مندارتان هەتا پاشا دێتەوە ئەوانیش گۆتیان : خانم کو دەبی بە تەنێ بە جێت بێلێن خانم گۆتی : ئەو شۆ ماریێ بابم دێن خوشکەکانم لێرە دەبن ئێرە ئاوەدان دەبی لۆیی ئیزنتان دەدەم ئەوانیش زۆریان پێخۆش بوو، وەکی خزمەتکار رۆیشتن شاژن لە باتی دۆستەکی سێ دۆستی هەبوو چووە کنیان و پێی گۆتن : پاشا چوویتە سەفەرێ ئەوشۆ وەرن چشتی خۆشتان لۆ دەکەم و پێکەوە رادەبوێرین بەرام هەرسێکتان پێکەوە مێن. بەرە بەری رۆژ ئاوا هەر جارێ یەکەکتان وەرن کەس نەتان بینی. شیوەکی باشی لێناو گۆشتی عەلیشیشێی سۆرکردەوەو فستق و فندقی دانا رۆژ لە سەر زەردی بوو، دەرویشەکی فەقیر دەفەکی شڕی بە دەستەوە بوو لە کۆرانێ دەگەڕا تووشی پیرێژنەکی بوو گۆتی : ئەرێ پلکێ فەقیرم زۆرم برسییە قەت پارو نانەکم نادەیێ پیرێژن گۆتی : مام دەروێش ئەها ئەو دەرکەی دیارە ماریێ پاشایە ئەوان نانەرو خێرکەرن، بڕۆ لەوێ

داوا بکە ئەمنیش وەکی تور فەقیرم .. دەوریش چوو لە دەرکەی داو دەستی کرد بە دەفە لیدان و مقام گۆتن .. شاژن دەرکەی کردەوە و گۆتی : کابرا چت دەویّ ؟ دەوریش گۆتی: فەقیرم خیرەکم پیّ بکە زۆرم برسییە ، ئەویش چوو نانی لۆ هیناو پارەی دایێ. هەر خوا خوای بوو دەوریش بروا گۆتی : بە خیر چی دەوریش گۆتی : شاژن خیرت دەگات نوینەکی شرم بدیّ لە بن ئەو دەرکەی دەنووم سبەینی دەرۆم بیّ جیّ و ریمە کەسم نییە شاژن گۆتی : بە خوای رازی نابم. لۆ خۆت کیوە دەچی برۆ دەرکەی حەوشەی لە سەر پیوەدا. دەوریش چوو لە بن دیواری ماریّ پاشای لیی پارداوەو لە سەر عەردی نووست. لە پڕ هەستەك هات و چاوی هەرینا دیتی پیاوەك لە دەرکەی ماریّ پاشای بە ئەسپایی چوو ژۆریّ، ئەویش خۆی مات کرد. دەمەکی پیچو پیاوەکی دی هات تاریك داهات یەکی دی هات دەرکەی حەوشەی کلیل درا. سەری سوڕما لە دری خۆی گۆتی : دەبی بزانم ئەوە چییە ؟ چوو لە سەر دیواری بە دزی ئاوا بوو خۆی لە پەنای ماتکرد، هەستی راگرت گیی لە قسەو گفتوگۆی شاژن و پیاوەکان بوو، هەرایەکیان بوو، قاقای پیکەنینی رۆژە ریپەك دەرۆیی و، تیگەیشت مەسەلە چییە. خۆی لە سەر دیواری ئاوا کردو چۆوە بن دیواری ماریّ پاشای لیّ ی نووست .. پاشا لە ریێ پشمی، گۆتییە خزمەتکارەکەی با بگەرینەوە، سەبری هینا ئەو سەفەرەی ناکەم .. هەردووکیان گەرانەوە گەیشتنە بەر دەرکەی نە پاسەوان نە خزمەتکار دیتی رەشاییەك دیارە لە بن دیواری، لیی چووە پیش دیتی پیاوەکی شرو وڕ خەوی لیکەتییە. مام دەوریش لە گەر رمبەی پیی ئەسپی پاشا واگاهات، پاشا لیی خوڕی گۆتی : ئەتوو چی لیرە ؟ گۆتی فەقیرم ، بیکەسم هاتیمە ماری پاشای گۆتم بیّ جیّ و ریمە ئەو شۆ جیم بکەن لە حەوشەی دەنووم. شاژن گۆتی جیمان نییە لۆ خۆت برۆ، ئەویش گۆتی : ئەمن پاشامە هەستە وەرە بابچین جیت دەکەینەوە . دەوریش خەنی بوو گۆتی : بە قوربانت بم پاشا، خوا خیرت بنووسی پاشا کلیلی پیبوو دەرکەی حەوشەی کردەوە لە ژۆریّ هەستیان کرد دەنگە دەنگ دیّ لە

حەوشەی، شاژن گۆتی وەلـلاّ دەنگـی پاشـای دێ ئـەوجا چ بکـەین؟ هەسـتن برۆنـە سـەر سندوقی نووینان لە پشت نوینان خۆتان بشارنەوە . پاشا لە هۆدەی خۆی دەنوی بەیانیان زوو بە دزی دەرکەتان لێ دەکەمەوە برۆن گۆتیان : باشە .
پاشا لە دەرکەی مارێدا ژنەکەی دەرکەی لێ کردەوە گۆتی : ئەیەرۆ ئەوە لـۆ بـەو نیـوە شەوەی هاتییەوە؟ پاشا گۆتی : ئافرەت لە رێ سەبری هینا ئەمنیش سـەبرم لێ ناکـەوی گەڕامەوە . بەرام ئەدی کانی خزمـەتکارو نۆبـەدار یەکـەکیان دیـار نینـەو ئـەتووش بـە تـەنێی : گـۆتی مـارێ بـابم لێـرە بـوون تـازە رۆیشـتن، ئـەمنیش خـەریکی ئـەو قـاپ و قاچاغانەم خڕیان دەکەمەوە خۆ مندار نیمە با هـەر بـە تـەنێ بم، نۆبـەدار و خزمـەتکار وەکی ئەتوو رۆیشتی ئەوانیش گۆتیان دەچنیە ناو مـارو منـدارمان هـەتا پاشـا دێتـەوە گێیان نەدا قسەی من. پاشا گۆتی : ئەدی مارێ بابت بەو شەوەی لۆ بە جێیـان هێشـتی وەرە نوینەکی بدە ئەو مام دەورێشەی با لۆ خۆی بنووی سەرمایتی هـەتا سـبەینی رۆژی لێ دەبیتەوە. ژنەکە چوو نوینی لۆ مـام دەورێـش هینـاو گـۆتی . بـرۆ لـەو دیـوی بنـوو دەورێش گۆتی ئەمن لێرە دەنووم ژنەکـە گـۆتی : ئێـرە شـارە مێروسـتانیی لێیـە شـەوێ خەوت لێ ناکەوی دەورێش گۆتی : داکم بمری بابم بمـری هـەر لێـرە دەنـووم پاشـا گـۆتی: لێیگەرێ لە کێ دەنووی با بنوی دیارە زۆر لا ملە . دەورێش هەستی کردبـوو پیاوەکـان لە پشت نوینان خۆیان شاردیتەوە بـەرە بـەری بـەیانیان هەسـتا لـە سـەر جێـی دانیشـت دەفەکەی دەست دایێ و دەستی بە مقامان کرد گۆتی : ئهم ئهم ئهـم . ئەمـە دووینـە ، ئەوان سێنە ئەمە دووینە . پاشاو ژنەکەی لە خەوێ راپەرین ژنە تێگەیشـت گۆتی : ئە ئەمگۆ با لەوێ ئەنوی مێروستان نایەلی خەوی لێبکەوی ئەو دورێشە شێت و شووره ئەویش هەر دووبارەی دەکردەوەو دەی گۆتەوە ، پاشا زۆر تورە بوو هات گـۆتی : ئەرێ ئەتو شێت بووی؟ دەورێش ئەنگوستی لۆ سندوقی نوینان درێژ کردو گۆتی : ئەمـە دوینە ئەوان سێنە هم هم هم ئەوجا پاشـا دری خرپـەی کـردو، کورسیەکی هینـا چـووه

سەرێ، تەماشای پشت نوینانی کرد سێ شینە زەلامی لێیە خۆیان مات کردییە : گۆتی: هەی سەگ بابینە وەرنە خوارێ لەگەر دەورێش دەست و پێی هەرسێکانی بەستاو، دار کاری کردن لە زیندانیی کردن هەتا مردنێ. ژنەکەشی کوشت و، دەورێش خەرات کرا. پاشا گۆتی : دەبی ئەتو لە کنە من بی نابی برۆی ئەو چاکەت لە گەر من کرد ئەو ئیشەت لۆ ئاشکرا کردم هەر مەمنونی توومە. پاشا ژنەکی دی هێناو ژنەکی لۆ دەورێشی هێناو پێکەوە بە خۆشی رایان بوارد .

# دنکە هەنار

هەبوو نەبوو ژنـەك و پیـاوەك هـەبوون. کیـژۆرەکی چـار سـارانیان هـەبوو نـاوی ( دنکـە هەنار) بوو. پیاوەکە گاوان بوو. ژنەکەی نەخۆش کەت، گـاوان زۆر فـەقیر بـوو نـەیتوانی عیلاجی بکا، یان بیباتە کن دوختـۆری. لـە سـەر مردنـیّ بـوو گـۆتی : پیاوەکـە توخـوا ئەگەر مردم قـۆرەکم بـبڕە لـە نـاو لبـادی بـدورە ئەگـەر بـە خـۆت یـان زڕداك لـە دنکـە هەنارەتان دا بەو پارچە لبادە لێی بـدەن . ژنـە مـرد گاوانەکـە قسـەکەی لـە بـیر نـەکرد وەسیەتەکەی بەجێهینا دەستی ژنەی بڕی و لە ناو لبادی دووری ..

بێوەژنەك هەبوو ناوی سـۆریّ چاوشـین بـوو، هـەموو رۆژی دەچـووە کـن دنکـە هـەنارەی دەیگۆ دنکە هەنارە بە بابت بریّ نەمنی بکاتە داکی توو ئەوجا هەر چشـتی جوانـت لـۆ دەکەم. دەبە داکت سەرت دەشـۆم و ئـەتوم زۆر خـۆش دەویّ. هـەموو رۆژی جـارەك دوو جار هەر دەچووە مـاریّ گـاوانی هـەتا وەی لێهـات گـاوان مـارەی کـردو هینـای، زڕداك ئەوەندەی ڕك لە دنکە هەنارەی دەبۆوە رۆژیّ جارەکی لێی دەدا بـە پارچـە لبـادی دنکـە هەنارە هەند جوان بوو وەك دنکە هەناری. رۆژەك سۆریّ گۆتی با بزانم ئەو لبادە چییە ؟ گاوان بە منی گۆتییە بەو لبادەی لە کیژەکەم بدە. لبـادی هەروەشـاند دیتـی دەسـتەکی بڕاوی لە ناوە دەستەکەی فریّدا سیّ چار رۆژان بە دەستی خۆی لە کیـژەی دەدا، هـەنارە بیّ رەنگ و لاواز ببوو. گاوان لەژنەی پرسی، ئەوە لۆ دنکە هەنارە بێرەنگە ؟ لێت دایە؟ گۆتی : ئەیەرۆ کو لێی دەدەم بەرام پارچە لبادم فریّ دا پیاوەکە گـۆتی : هـەی عـەمرت نەمێنی ئەو پارچە لبادەت لۆ فریّدا؟ نازانی دەستی داکـی خـۆی بـوو لـۆیی لـە کـورتی نەدەدا. ئەویش گۆتی : هەی نا پیاو لـە نـاو قـەبریش لـە منـت خۆشـتر دەویّ ... سـار

سوڕاوە سۆریێ چاوشین کیژەکی لە گاوانی بوو. هەتا بڕێی ناشرین و ئێسك گران بوو، ناوی لێنا خۆخیێ. کیژەکان هەردوکیان گەورە بوون جاحێر بوون . هەموو ڕۆژیێ لە باتی بابیان دەچوونە بەر گاڕانیێ، سۆدیێ یەك و تەشییە خوری دەدانیێ دەیگۆ هەتا ئێواریێ دێنەوە هەمووی بڕێسن .. بەرام کوولیە خوری دنکە هەنارەی زۆرتر بوو لە ئی کیژەکەی خۆی، هەتا زیاتر ماندی بی. ڕۆژیك بووە تۆزو باو گەردەلوول با خوری دنکە هەنارەی برد، هەنارەش لە ترسی زڕداکی دو بە دوی چوو هەتا گەیشتە بەر دەرکەی ئەشکەفتەکی، دێوەك لەویێ دانیشتبوو هەندی کەرتکە شاخەکی،خوریەکەی لە کۆشی خۆی دانابوو. دنکە هەنارە بە ترس و لەرز گۆتی: داپیرە ئەو خورییە ئی منە با هێنایتی، خێرت دەگاتی بدەوە دەنا زڕ داکم دەمکوژی. دێوە گۆتی : کیژم ئەتو وەرە هەندەك سەرم بنۆڕە بزانە چی تێدایە ؟ دنکە هەنارە لە ترسان چوو هەندی دەیکرد نەیدەزانی کوو ئەو سەرە سپیەی بڕۆنی، هەندەك بڕێشکەی لە ناو بوو سەری دێوەی دەڕۆنی و دنك دنك بڕێشکەی لە دەوی خۆی دەناو دەیخوارد و دەیخرتاند. دێوەکە گۆتی : هەنارە ئەو قرچە قرچە چییە ؟ ئەویش گۆتی : داپیرە سەرت هەند خاوێنە بۆنی گوری لیێ دیێ دنکە دنکە ئەسپێی تێدایە چونکە بۆنی سەرت خۆشە دەیان خۆم قرچەی دیێ.
دێوەکە ئەو قسەی پیێ خۆش بوو گۆتی : خوا بە قوربانی ئەقری خۆت بکا، وەرە لە سەر ئەو جۆگەی ڕاوەستە سیێ ئاو دیێ یەکی سپی، یەکی لیخن، یەکی ڕەش وەکی ئاوە سپییەکە هات گاسم بکە دێم خوریەکەت دەدەمەوە. گۆتی : باشە ئاوەکان هاتن دنکە هەنارەش زۆر ترسا گۆتی : خوایە دەبی چم لێبکا ئاوی سپی هات گۆتی داپیرە وەرە ئاوەکە هات دێوە پەلی دنکە هەنارەی گرت و لە ناو ئاوەکەی هەرکێشاو هینایە دەریێ.
دنکە هەنار چەند جوان بوو، هەندەی دی جوانتر بوو وەك مانگیێ شەوقی دەداوە، هەموو جلك و بەرگی بووە زێر. هەتا هەنارە خوریەکەی وەرگرتەوە ڕۆژ لە ئاوا بوون بوو. خۆخی بە تەنیێ چۆوە ماریێ گۆتی : دایە بووە تۆزو با ئەمن هاتمەوەو نازانم هەنارە چووە کیێ ؟

هەر گاو گۆلکەك لۆ لایەکی رۆیشتن ئەمن بە تەنێ ئـەمتانی بیـان هینمـەوە، داکـی زۆر تووڕە بوو گۆتی ئەو کچەتیمە چوویتە کێ ؟ بەرە بەری رۆژئاوا دنکە هەنارە بـەرەو مـار دەچۆوە گاو گۆلك چاویان بە هەنارە کەت هەموو خڕبوونەوەو، دەوریـان لێـدا. لـە دووی رۆیشتن جۆگەکیان لە پێش بوو هەنارە بازی دا لە جۆگەی بپەریتەوە لینگە پێراوەکـی لێ کەتە ناو جۆگەی. لەو وەختی کوڕی پاشای بە سواری دەگەڕا لەو ناوەی چاوی بـە دنکـە هەنارەی کەت ئەشقی بوو. چاوی لێبوو پێراوەکەی کەتە جۆگەی خێرا لە ئەسپی دابەزی و، دەستی لە جۆگەی نا بـە دزی پێراوەکـەی دەرینـا و شـاردی یـەوە. گـۆتی ئـەو کیـژە پاشایە لۆ بە تەنێ لێرەیە؟ کیژەکە هەر گەڕا پێراوەکەی نەدیتەوە، زۆر عێدز بوو. کـوڕە پاشا سەلامی لە کیژەی کردو لێی پرسی ؟ پێم بڵێ ئەتوو کیـژی چ پاشـایەکی و نـاوت وچییە و لە چ دەگەڕێی ؟ کیژە گۆتی: ناوم دنکە هەنارەیە و بـابم گاوانـە لێنگـە پێـراوم کەتە جۆگەی. گۆتی خەمێ مەخۆ ئەگەر نەتدیتەوەلینگەکت لـۆ دروسـت دەکـەم، بـەرام باوڕی نەکرد ئەو کیژە جوانە کیژە گاوان بی. وەکی دنکە هەنارە گەیشتەوە مارێ سۆری چاوشین وەخت بوو بمری لە خەمان. گۆتی ئەوە لۆ وەهات لێهاتییـە بـە چ ئەوەنـدە جـوان بووی ؟ کچەتیم. ئەویش هەمووی لۆ گێراوە. گۆتی درۆی دەکەی ئەویش سوندی خـوارد درۆی ناکا، حەز دەکەی سبەینێ خۆخی بنێرە بەشکو جوان دەبی. رۆژی دوایـی خـۆخێ وەکی هەنارەی کرد بە دوو خوری داچوو هەتا گەیشتە ئەشکەفتێ بە دێوەی گـۆت : هـا جادوکەری سحرباز ئـەو خوریـەم بـدەوە دێـوە گـۆتی وەرە هەنـدەك سـەرم بنـۆڕە ئـەوجا خوریەکەت دەدەمەوە خۆخی گۆتی : کوو بێژم دێ دەسـتی خـۆم پـیس بکـەم بـە سـەری توو. دێوەکە گۆتی : باشە وەرە سەر ئەو جۆگەی راوەستە سێ ئاو دێ لەو جۆگەیە وەکی ئاوە لیخنەکە هات گاسم بکە، ئەوجا خوریەکـەت دەدەمـەوە. کیـژە هـاواری کـرد وەرە مەڕۆ وا ئاوەکە هات خێرا بە درەنگە. پـەلی گـرت لـە ئـاو لیخنـی وەرداو دەری هینـا. گۆتی دەوجا بڕۆوە کن داکت. چـەند ناشـرین بـوو هەنـدەی دی ناشـرینتر بـوو هـەر لێـی

دەترسای. خوخێ چۆوە کن داکی دەستی بە گریانی کرد. گۆتی : بزانە چم لێهاتییە بە خۆتوو بە هەنارەی گۆتتان برۆ. داکی مستەکی لە سینگی خۆی دا گۆتی : هەیرۆ داکت کۆرە بی ئەوە بە چ وەت لێهاتییە وەرە با کەس نەتبینی، ئەو کچەتیمە لۆ ئەوەندە جوان بوو ئەتووش لۆ وەهات لێهاتییە؟ دیارە ئەو قسانەی کردی هەمووی درۆیە بەراستی بە منی نەگۆتییە، دەبی هەر بیفەوتێنم.. کوڕی پاشای چووە کن بابی گۆتی : ژنم دەوێ پاشا گۆتی : کوڕم کیژی چ پاشایەکت دەوێ دەچم لۆت دەخوازم. گۆتی بابە ئەمن هەر کیژی گاوانم دەوێ. گۆتی : کوڕم کوو دەبی ئەتو کوڕی پاشای کیژی گاوانی بینی . گۆتی : هەر دەمەوێ ناوی ( دنکە هەنار) هیە. پاشا ناردییە دوو گاوانی گۆتی : دنکە هەنارەی کیژت دەبی بدەیە ئەحمەدی کوڕم. گاوان لە خۆشیان باوەڕی نەکرد. گۆتی : گەورەم کیژ کیژی خۆتە پێشکێش بە کوڕی تووە. مەلایان هینا کیژەی مارە کرد لە کوڕی پاشای، کوڕە بە پەلە بوو گۆتی : هەتا سێ رۆژی دی بووك حازر بی. دەستیان کرد بە شایی و هەراو بەزم. سۆری چاوشین هەستا نەی کردە نامەردی کیژەکەی خۆی ڕازاندەوە تارای رەنگاو رەنگی بە سەر داداو ( دنکە هەنار ) ەی لە ناو تەندوری نا سەری داپۆشت ، گۆتی : دەنگی بکەی سەرت دەبڕم مایندکیان رازاندەوە بوکیان سوار کرد بردیان لۆ ماری پاشای، بوکیان دابەزاند دایاننا زاوا چوو دەستی بوکی گرت، هینایە ناو شایی تارای لە سەر لابرد، لە جێی خۆی دەمەك بوو حەپەساو لە خۆ چوو. خەرکە کە هەموو کشانەوە پاش گۆتیان : ئەگەر دەمانزانی ئەو بوکەیە قەت خۆمان ماندی نەدەکرد. سارد بوون لە جێی خۆیان گۆتیان : کو کوڕی پاشای حەزی لەو گورگەی کردییە زاوا بە خۆ هاتەوە گۆتی داکم بمری بابم بمری ئەو کیژە هەو نییە ئەوەی ئەمن داوام کردییە، دەسگیرانی من دەرێی مانگە . ئەو بووکەم ناوێ لینگە پێراوی هەنارەی وا لە کنەمنە لە پێی کەن بزانن پێی وی یە یان نا. لینگە پیراوی زێریان هینا بە پێی خۆخێ وە نەچوو. کورە گۆتی :برۆن چار دەورەی ماری گاوانی بگرن بزانن زرداك

ساحێبی ئەو پێڵاوەی چ لی کردییە. گاسیان کرد هۆ هۆ سۆرێ چاوشین کانی دنکە هەنارە ؟ گۆتی : ئەدی ئەتانبرد. گۆتیان درۆیە ئەوە هەونییە گۆتی : درۆ نییە وەرن بزانن چ کیژی دی لێرە هەیە هەر ئەو کیژەم هەیە. کەرەبابەك چووە سەر تەندورێ، بانگی داو قوقاندی گۆتی : ئو ئو ئو . بوکە سورێ، لە ناو تەندورێ دوو جار ئەوهای قوقاند. سۆرێ چوو بەردەکی لێدا پیاوەك ئاگای لێبوو گۆتی : وەرن بزانن ئەو تەندورە چی تێدایە ؟سەری تەندوریان هەرداوە، مانگەك شەوقی داوە لە بەر جوانی هەنارەی هەندەك کوڕوکار بێ هۆش بوون، خەبەر چوو لۆ کوڕی پاشای بە سواری هات چووە کن سۆرێ چاوشین لینگە پێڵاوی زێڕێ دەرینا گۆتی : ئەوە پێڵاوی دنکە هەنارەیە ئەمن ساحێبی ئەوەم دەوێ، نەك ئەو کیژە گورگەی ئەتو ناردیتت، ئەوجا دنکە هەنارەیان هەر بەو جلك و بەرگەی لە بەری بوو بردیان پێویستی بە رازاندەوە نەدەکرد. خەرکەکە هەموو سەریان سوڕما لە جوانی ئەو کیژە، گۆتیان : هەتا هەوکە ئەمە ئەو کیژەی گاوانمان نەدیتی‌یە شایی گەرم بوو، بوکیان هینا. شایی و دۆرو زوڕنا رۆژە رێیەك دەرۆیی لە بەر جوانی بوکێ شایی بەرنەدەدرا ، قەسرەکیان لۆ گاوانی کرد لە تەنیشت ماڕێ پاشای سۆرێ چاوشین و خۆخێ ی کیژیشیان هاوێشتە ناو چارێ بە منداران بەردا بارانیان کردن ... کراسم دراو چم پێ نەبرا .

# گێکەرەو حەمبەروچڵە

هەبوو نەبوو ژنەك و پیاوەك هەبوون، منداریان نەدەبوو. هەموو رۆژێ پیاوەکە بارەداری دەبردە شاری دەیفرۆشت و پارەکەی بە خواردن و شمەکی دەدا. رۆژەك گۆتییە ژنەکەی وا باشە ژنەکی بینم بەشکو خوا ئاورەکم لێدەداتەوە منداروکم دەبی. ژنەکەی گۆتی پیاوەکە دەوس بە، بە تەمای خوای بەشکو هەتا لە سەفەرێ دێیەوە خوا ئاورم لێدەداتەوە، وا لە رێیە لە بەرتوو دەنگم نەکردییە. پیاوەکە باوەری نەکرد گۆتی : ئافرەت : دەچمە شاری شەوم پێدەچی، چونکە سێ بارەدارە ئەوجا هەتا دەیانفرۆشم. گۆتی : دەبرۆ ئامانەتی خوای بی ... ژنەکە گۆتی : با عیلاجەکی بکەم کەرەکیان هەبوو هەردوو گێیی بری و کەرەی بەرەڵڵا کرد، گێیەکانی لە ناو لانکی ناو بە دەسترازەی پێچایەوە، دووگردەکی پێدادا لە ناو مارێ داینا. دەستنوێژی شوشت و دانیشت هەر لە بەر خوای پاراوە. گۆتی : ئەی خوای گەورە روحمەکم پێ بکە لە کنەتوو گەلە ئاسانە ئەو گێیە بیتە منداروك. هەند پاراوە هەند نوزاوە خوا دوعای قبور کردو گێکەرەی کردە کورەکی ساوا. بەرام هەردو گێیەکانی وەکی گێی کەرێ بوون. بەس گچەکتر بوون. پیاوەکە هاتەوەو سەلامی کرد سەری سورما ! دیتی وا ژنەکەی چارشەوەکی بەخۆی دادایەو لانکی دەژینی. لێی پرسی ؟ ژنەکە ئەوە چییە ؟گۆتی : پیاوەکە نەم گۆ هەتا دێیەوە کورەکمان دەبی و دەستی بە گریان کرد. پیاوەکە گۆتی : کچی ئەتو لۆ دەگرییی چ بووە دەنگێ بکە . پیاوە چوو سەری لانکێ هەرداوە چاوی بە کورەکە کەت گۆتی : ئوخەی زۆر شوکرم سابیرم خوایە بەو بەشەی دایتت . دیارە بە

خۆت ڕەزات لە سەرە ئەوەش نیشانەیە ڕوی لە ژنەی کرد گۆتی : بە خوای تازە ژنی ناینم بە ئاخری عومری بوینە داك و باب. ژنە وەکی گێی لە قسەی پیاوەکەی بوو زۆر دری خۆش بوو. بابێ کورەی چووە شاری دووبارە داری برد هەمووی لۆ کوڕەی خەرج کرد. شمەکی لۆ کڕی و هینایەوە. گۆتی : ئافرەت ناوی لێدەنێم گێکەرە. ژنەکە گۆتی : پیاوەکە ئەو ناوە کو دەبی، با ناوی خوا دابی، پیاوەکە گۆتی : بە خوای ئەمن پێی دەرێم گێکەرە. گێکەرە گەورە بوو خەرکی ئاوایی هەموو خۆشیان دەویست. چونکە مندارەکی نەقوستان بوو چیشتیان لۆ دەکڕی و کیژ لەگەر خۆیان دەیانبردە داران، ئەویش ئیشی لۆ دەکردن ڕۆژەك گۆتییە داکی هەندەك برێشکەم لۆ بکە کلدانەك و نەینۆکەکم بدێ، سبەینێ لەگەر کیژان دەچمە داران. داکی هەمووی لۆ حازر کرد سبەێنی زوو لە گەر سێ کیژان ناویان ( زارێ ، لاری ، کارێ ) ڕۆیشتن لۆ داران لە ڕێی گێکەرە قسەی سەیرو خۆشی لۆ دەکردن ئەوانیش پێدەکنین. هەتا لە ئاوایی دورکەتنەوە هەندەکیان دار خڕکردەوە. زارێ گۆتی : ئەوڕۆ لە بیرم کردییە کلی لە چاوم بکەم گێکەرە گۆتی : فەرموو زارێ ئەمن کلدانم پێیە لارێ گۆتی : بریا نەینۆکەکم پێبوایە تەماشای خۆم بکردبایە نەینۆکیشی داوی. کارێ گۆتی : بریا ئەمنیش هەندەك بریشکەم پێبوایە لە سەر ئەو گردە خۆشەی بمان قرتاندبایە. گێکەرە گۆتی : براتان خۆشبی هەموو چشتەکم پێیە. توورەکە برێشکەی دەریناو یاڵلاّ با دانیشین بخۆین. لە سەر گردی دانیشتن لنیگیان لێ درێژ کرد. لە بەر قسەکردن و بریشکە خواردن داریان لە بیرکرد. گێکەرە گۆتی : کیژینە وا ڕۆژ ئاوا بوو، هەستن پشتییە داران ببەستین و بڕۆین. هەستان بە پەلە پەل داریان بەست. گێکەرە بە پشتی دادان و ڕۆیشتن. لە نیوەی ڕێی گێکەرە دانیشت گۆتی: وەیرۆ زگم دێشی ، دەبی لە پشتێم بکەن پێم ناکرێ بڕۆم گۆتیان : گێکەرە درەنگە هەستە با بڕۆین ناگەینەوە مارێ. گێکەرە گۆتی : کو برێشکەتان خواردییە ئەوهاش دەبی لە پشتێم بکەن دەنا لە گەرتان نایێمەوە. ئەوانیش لە ترسان داریان دانا بە

هەرسێکیان گێکەریان شێلا شان و ملیان پەستاوە گۆتی : هەندەك چاکبومەوە رۆژ ئاوابوو گۆتیان گێکەرە چت لێکردین ؟ قەت ناگەینەوە ماریێ گۆتی : بڕۆن مەترسێن هەتا ئەوان مشتو مڕیان کرد تاریك داهات، رۆیشتن ترسیان لێ نیشت ڕێیان بزر کرد، بەڕێیەکی دی دا رۆیشتن، لە دوور گێیان لە حەپە حەپی سەی بوو، لە لایەکی دی تریسکە ئاگرەك دیار بوو. گێکەرە گۆتی : با بچین بزانین ئەو تریسکە ئاگرە چییە ؟ دەبی بنیادەم بی لە بەر ئەو ئاگرەی بەرام حەپەی سەیان دێ، نەکو بمانگرن، رۆیشتن، گەیشتنە تریسکە ئاگری. دیتیان دێوەك دانیشتییە هەندی گردەکی، زراویان چوو، زۆر ترسان. گێکەرە گۆتی : مەترسێن زمانتان شرین بی، دێوەکە چاوی پێکەتن خەنی بوو، بە پیریان وەچوو گۆتی : وەرن بە قوربانتان بم، ئەوە بەو شەوەی لۆ چ هاتینە چاوی داکتان کۆرەبی، وەرن دانیشن نانتان لۆ حازر بکەم بخۆن و بنوون. دەزانم ماندی بوونە لە ڕێێ هاتینە جێی لۆ رایەخستن گۆتی : ئەوجا بنوون. ئەوانی لە بن نوینی ناو بە خۆی دەستی دا چەقوی تیژ بکا هەتا سەریان پێ ببڕی، گێکەرە تێگەیشت. گۆتی : با نەنووم بزانم چ دەکا ؟ کیژەکان خەویان لێکەت ئاگایان لە چ نەبوو، دێوەکە ناوی (حەمبەروچك)ە حەمبەروچك گۆتی : ئەرێ کوڕم ئەوە لۆ نانوی؟ ئەویش گۆتی : داپیرە هەموو شەوێ داکم برێشکەی لۆ دەکردم ئەوجا خەوم لێدەکەت. دێوە گۆتی : کوڕم ئەمنیش لۆت دەکەم. هەتا ئەو برێشکەی کرد بووە بەیانی رۆژ هەرات، کیژەکان واگا هاتن. هەندی کردیان دێوەکە ڕێی نەدانێ بڕۆن. هەر فێری دەدیتەوە گۆتی : دەبی ئەو شۆش لێرە بن سبەینێ بە خۆم دەتانبەمەوە. شەوی دووەم دیسان کیژەکان نووستن گێکەرە نەنوست. گۆتی : کورم گێکەرە لۆ نانوی گۆتی ئاخر هەموو شەوێ هێلکەو رونی دەخۆم ، ئەوجا خەوم لێدەکەوی دێوە هێلکە و رونی لۆ کرد. دیسان رۆژهەرات دێوە چی پێ نەکرا. کیژەکان گۆتیان : کێگەرە قوتارمان بکە لەڕێی خوای ئەمە چ بکەین؟ گۆتی : ئەوشۆ تەگبیرەکی دەکەین بەشکو قوتار دەبین. شەوی سێیەم گێکەر

گۆتی : داکم لە کانییَ ئاوی لۆ دەینام لە ناو ( بێـژینگی ) دێـوە گـۆتی : کـوڕم ئـاو بـە بێژینگی کو دەبـی. گـۆتی : داکـم کونـەکانی بـە بنیشـتی پـڕ دەکـردەوە، ئـەوجا ئـاوی تێدەکرد. ئیَ دەباشە ئەمنیش وا دەچم بە بنیشت کونەکانی پڕدەکەمەوە. ئەوجا گێکەرە گۆتی : هەستن هەندەك دڕك و دار بیـنن لـە کـن دەرکـەی دانبـێن. ئـەنگۆ هەرسـێکتان خۆتان بشارنەوە، ئەمنیش تەگبیری خۆم دەکەم. کیژەکانی شاردەوە لـە پەنایـەك گێکـەر قالبەك سابون و شەیەکی داری لە باغەری خۆی دانا، دێمکە ئاوەکی لە ناو قـەدی خـۆی قایم کرد، خەنجەرەکی هێنا لەناوەندی مارێی دانا، بە خـۆی چـووە بـن کاریتـەی. خـانی حەمبەرچك هاتەوە، گۆتی : ئەو هەموو دارە چییە ؟ لە پێش دەرکەی داندرایـە. گاسـی کرد هۆ هۆ گێکەرە کەس دەنگی نەبوو، گۆتی دیارە لە بن ئەو دارانە خۆیان شاردیتەوە، خۆی بە سەر دادا دڕك هەموو لە بەدەنی چەقی. دەم و چاوی بە خین هـات، چـووە ژۆریَ کەس لەویَ نەبوو، وەکی سەری برند کرد دەبینی گێکەرە لە بن کاریتەیە گـۆتی : کـوڕم ئەوە کو گەیشتیە ویَ گۆتی : داپیرە پێت لە سەر ئەو خەنجەرەی دانیَ ئـەمنیش دەسـتت دەگرم دەگەیە کنە من. دێوە پێی لە سەر دانا، خەنجەر لە پێی راچوو بووە دوو کـەرتك، خین بە گۆریَ وەربوو گۆتی : کوڕم چت لێکردم؟ گۆتی : داپیرە ئەتو نەتزانی بە سەرکەوی دەی خێرا هەنـدەك خـوێی پێداکـە، هـەتا چـاکبیتەوە. ئـەویش بـە قسـەی کـرد، خـوێی پێداکرد دەم و دەست بێهۆشبوو، گێکەرە هاتە خواریَ کیژەکانی گاس کرد، گۆتی : یاللاَ هەرێن، هەر چاریان هەراتن. دێوەکە بە هۆش هاتەوە گۆتی : گێکەرە دەردت لە گیـانم، دەبی بە بریناری بە دووت بکەوم و بتگرم ئەو فێـرەت لـە مـن کـرد ... حەمبەروچـك کەتە دویان گۆتی : کوڕم گێکەرە راوەستە لە گەرتان دێم ئەمن بێکەسم، ئەوان هـەراتن ئەویش بە دوویان کەت . هەندەی نەمابوو بگاتە کنیان کیژەکان هاواریان کرد گۆتیان وا گەیشـتیَ، گێکـەرە قالبـە سـابونەکەی تێهـەردا پـێش دێـوەی، گـۆتی: خوایـە بیکەیـە بەردەکی گەورە و لووس ئەو دێوە نەتوانی بەسەردا بڕوا. سـابوونەکە بـووە بـەرد، بـەرام

دێوەکە خۆی پەراندەوە دیسان لە دووی غاردان، ئەو جارە شەیەکەی فڕێدا، گۆتی : خوایە بیکەی بە دارستانەك قەت پێی نەکرێ بپەڕیتەوە کنەمە. ئەویش بووە دارستانەك. دیسان دێوە بە کەلەنی داران خۆی دەرباز کرد و، کەتە دوویان. کیژەکان گۆتیان قەت قوتار نابین، وا گەیشتێ گێکەرە گۆتی بە تەمای خوای، دێمکە ئاوی تێهەردا گۆتی خوایە بیکەی بە زێیەك قەت نەپەڕیتەوە خوا دوعای قبور کرد، بووە زێیەك ئەوجارە حەمبەروچك پێی نەکرا بە ناو زێی دابڕوا گۆتی کوڕم گێکەرە ئەنگۆ کوو پەرینەوە هەتا ئەمنیش بێم لەگەرتان. گێکەرە گۆتی : داپیرە بڕۆ دوو دەستارێ بینە پێی خۆت لە ناو کونی دەستارەکە دانێ وەرە ناو زێی دەپەرییەوە. هەتا دێوە چوو دەستاری هینا ئەوان خۆیان قوتار کرد، دێوەکە بە دەستارەوە کەتە ناو زێی ی و خنکا. ئەوجا ڕۆیشتن گەیشتنەوە گوندی خۆیان. کیژەکانی گۆتیان : گێکەرە ئەمە ناوێرین بچینەوە داك و بابمان دەرێن داخوا کێوە چووینە. ئەتوو لە پێشەوە بڕۆ حارو مەسەلەی هەموو بگێرەوە، وەرە خەبەرمان لۆ بینەوە. گێکەرە چۆوە ناو گوندی خەرکی چاویان بە گێکەرەی کەت، هەموو خڕبوونەوە گۆتیان : کا ئەو کیژانەت چ لێکردییە هەر ئەلعان سەرت دەبرین. گۆتی : ڕاوەستن با لۆتان بگێرمەوە کیژەکانتان ساغ و سەلامەتن، مەترسێن. ئەوانیش هەموو گێیان ڕاگرت هەتا قسەکانی گێراوە و چیان بە سەر هاتییە ئەوجا گێکەرەیان ماچ کرد، زۆر زۆر مەمنونی بوون. چوون کیژەکانیان هیناو دەستیان کرد بە شایی و هەراو خێرکردن. داك و بابی گێکەرەش بە کوڕەکەیان شاد بوونەوە داك و بابی کیژەکان گەلەك پارەیان دا گێکەری، شەکیان لۆ کرد گۆتیان مادام ئەتو هەندە پیاو بووی ئاگات لەو کیژانە بووە، ئەمەش ژنەکت لۆ دەینین، لە سەر حیسابی خۆمان شاییت لۆ دەکەین. ژنیان لۆ گێکەرەی هیناو شایی کراو، داك و بابی گێکەرەی خەنی بوون لە خۆشیان گێکەرەش گۆتی : ئەمن هەر خزمەتکاری خەرکی گوندەکەی خۆمم . کراسم دڕاچم پێ نەبڕا .

# کوتە مەڕ

هەبوو نەبوو پیاوەك ناوی کوتە مەڕ بوو. ژنەك و دوو کوڕی گچکەی هەبوو. هەتا برێـی دەست کورت بوو. هیچیان نەبوو. لە گوندەکی دەژیان نەهاتی ڕووی تێکردن. دەغـرودان بە کڕین نەدەهات. کەس ئیشەکی پێ نـەدەکرد. لـە گوندەکـە دارتاشـەکی دەورەمەنـدو ڕەزیل و سەڵت و قوڵت هەبوو، هەر ڕۆژێ شاگردەکی دەگرت و دەری دەکرد. کوتە مـەڕ چووە کن ئەو دارتاشەی گۆتی دەبمە شاگردت، ئەویش گۆتی ئەمن شاگردی ناگرم، ئەگەر دێی لۆ خۆت فێر دەبی ئیشم لە گەر بکـە بـە خـۆڕایی، بـەرام ئـەمن ئیشـکەرەکم دەوێ نافرەت بی ڕۆژێ بێ مارەکەم لۆ خاوێن بکاتەوە، شیوم لۆ لێنێ و پاش ئیوارانێ بچیتـەوە مارێ خۆی، مانگێ پارەکی باشی دەدەمێ. ئەویش هەر چەند پێی نـاخۆش بـوو. خـۆی بەرام چونکە چیان نەبوو بخۆن، ڕازی بوو چۆوە مارێ بـە خێزانەکـەی گـۆت. خیزانەکـەی گۆتی قەت ئەو ئیشەم پێ خۆش نییە، بەرام ئەگەر نەچم لە برسان دەمرین. ژنەکە چـووە مـارێ دارتاشـی ئیشـی کـرد. هـەموو ڕۆژێ شـیوی لێـدەناو پارەکیشـی دەهینـاوە لـۆ مندارەکانی، تومەز ژنەکە جوان بوو دارتاش حەزی لێکرد، لە دوکانێ هاتـەوە هەنجـەتی پێگرت. گۆتی ئەوڕۆ مارەکەت باش خاوێن نەکردیتەوە، ئێوارێ میوانم دێ. ئەویش خوا خوای بوو دارتاش ڕازی ببی، گۆتی : ئەتو عێـذز مەبە ئەمن درەنگتر دەچمەوە بە کەیفی توو خاوێن دەکەمەوە. ژنە نەیدەزانی کابرا نیازی خراپی هەیە. کوتە مەڕ کەتـە قـرت و قرتـێ چـونکە ژنەکـەی قـەت ئـەوها درەنـگ نەهاتیتـەوە، گۆتییـە منـدارەکانی ئـەنگۆ

دەرکەی لەسەر خۆتان پێوەدەن دەچم بزانم داکتـان لـۆ نەهاتـەوە. چـووە دەرێ لـە سـەری کۆرانێ تووشی برادەرەکی بوو ناوی حەمە بوو. دەستی بە کەلەکەی خۆی وەنابوو گۆتی: کوتە مەڕ ژانم گرتییە، بمگەیێی بمبەوە مارێ، بـە خـۆم نـاتوانم بـرۆم. کوتەمـەڕ چـوو لـە پشتێ کرد بردییە مارێ. خێزانی حەمەی گۆتی : دەبی هەر بێی دابنیشی ماندی خـۆت بحەسێنیەوە. ئەویش گۆتی منداڕەکانم بە تەنێ لە مارێ بە جێ هێشتییە، نەیان هێشـت بڕوا خواردن حازر بوو گۆتیان دەبی نانی بخۆی، ئەوجا برۆی. ئەویش هەتا نانی خواردەوە درەنگ داهات. گۆتی بابرۆم بزانم داکی منداران نەهاتیتەوە. چۆوە مارێ کورەکـانی کـە ناویان ( خلەو بلە ) بوو خەویان لێکەتبوو. داکیان نەهاتبۆوە، رۆژ ئـاوابوو دنیـا تاریـك داهات. گۆتی : با بچم خۆ لەو ژنەی خۆش نابم بزانم چی بە سەر هاتییە ژنەکی زۆر باش و بە ئەدەبە قـەت بـاوڕ ناکـەم ئیشـی خـراپ بکـا. چۆوە مـارێ دارتاشـی لـە دەرکـەی حەوشەی چووە ژۆرێ کەسی لە مـارێ نـەبوو. نـە دارتـاش دیـارە نـە ژنـەش. تەماشـای ژۆرێی کرد خانیەکی چۆل و حۆل کوتە مەڕ لە سەری خۆی دا گۆتی : ئەی هـاوار قـوڕی کێ بە سەری خۆم دابکەم. دەستی هەردوو کوڕی گرت و لە گوندی چووە دەرێ. گـۆتی : با بچمە جێیەکی کەس نەمناسی. رۆیشتن گەیشتنە ڕوبارەکی گەورە، کـوڕەکی لـە سـەر پشتی خۆی دانا پەراندییەوە ئەو بەری، گەڕاوە کوڕەکەی دی بپەرێنتەوە ئەویشی لە سەر پشتی خۆی دانا هەتا نیوەی ڕێێ رۆیی کورەکەی ئەوبەری زیڕاندی، بابی سەری برند کرد گورگ کورەکەی برد. لە خەمان ئەوی دی لە سەر پشتی کەتە روبارێ ئاو بردی. لـە تـاو کورەکانی لە سەری خۆی داو دەستی بە گریانێ کردو دانیشت. شـەوی بـە سـەر داهـات گۆتی : خوایە زۆر شوکرم بە کاری تور، وا دەرۆم بزانم تووشی چ دەبم رووی لـە شـارەکی کرد، لەوێ ئیشی دەکردو پارە نانەکی پەیدا دەکرد. خەرکەکە زۆریـان خـۆش دەویسـت، چونکە ئیشەکی باش و بێ فێری دەکرد، باشی لۆ ڕێـك کـەت. بـەرام رۆژێ تێـرو پـڕ لـۆ منداڕەکانی دەگریا، پاشای ئەو شاری مرد. عادەت وەها بوو کە پاشـا بمردبـا بازەکیـان

هەر دەدا لە سەر سەری هەر کەسەکی بنیشتیا ئەو دەبووە پاشا. بازیان هەردا لە سەرسەری کوتەمەڕی نیشت گۆتی : ئەی قوڕم بە سەر بەخوا باز خەرەتی کردییە، ئەمن نیمە داخوا کێیە ؟ خەرکەکە گۆتیان : نابی ئەوە نازانی پاشایەتی چییە ؟ سێ جار بازیان هەردا، باز چۆوە سەر کوتە مەڕی. ئەوجا گۆتیان دیارە پاشایەتی قابیل بەو پیاوەیە، کردییانە پاشا. کوتە مەڕ لە خۆشیان باوڕی نەدەکرد، زۆر بە چاکی و رێك و پێکی پاشایەتی بەڕێوە دەبرد، لۆ خەرکەکەی زۆر باش بوو، خۆی خۆشەویست کرد، سوندیان بە سەری دەخوارد. وەزیرو گزیرو پیاو ماقولانی پاشای گۆتیانە پاشای دەبی ژنی بینی، کو دەبی ئەتو بێ ژن و منداری. ئەویش هەناسەیەکی ساردی هەرکێشا، مندارەکانی بە بیرهاتەوە گۆتی : قەت ژنێ نایینم ئەو قسەم لەگەر مەکەن ......
بێینەوە سەر باسی کوڕەکانی: رۆژەك لە دوڕ بانەکی تووشی یەك دەبن یەکدی ناناسن سەلام لە یەك دەکەن خلە دەرێ ئەرێ برا ئەتو لە کێ هاتێ و دەچییە کێ ؟ ئەویش دەرێ وەڵلا چەند سارە شوانی دەکەم و لێی بیزارم بووم : دەچمە ئەو شارەی وا لێرە دیارە دەرێن لەوێ ئیش هەیە، خێرو بەرەکەتی هەیە، پاشایەکی زۆر باشیشی لێیە لۆ فەقیران هەر مەپرسە لە باشی ... بلەش دەرێ ئەمنیش هەر لۆ ئەو شارەی دەچم، وەرە وەکی برایان پێکەوە بچین ئیش بکەین، چەند سارە لە گەر ماسی گران ڕاوە ماسی دەکەم، بێزار بووم وازم لێ هینا. هەردووکیان دەچنە شاری و دەچنە کن پاشای دەرێن ئەمە زۆر فەقیرین دەبی ئیشەکمان پێ بکەن، لە دیوەخانی پاشای پاشا دەرێ ئەگەر ئەنگۆ دەست پاکژبن ئەوە لە کۆشکی خۆم دەتانکەمە پاسەوان رازی دەبن؟ گۆتیان : ئەگەر ئیشەکی خراپت لە مەدیت لە سەرمان بدە. بوونە پاسەوان، خەنی بوون تەپری شایان لێدەدا. لێیان پرسین ناوتان چییە ؟ گۆتیان ( حەمەد و ئەحە ) یە. خەبەریان لۆ پاشای هێنا بازرگانەك هاتیە گەوهەری دەفرۆشی پاشاش گۆتی : بڕۆن بڕێن بێنە ئێرە ئەمن لێی دەکڕم. بازرگان هات لە بەر پۆشتەیی و رێك و پێکی یەکدیان نەناسیەوە.

پاشا چەند دەنکە گەوهەرەکی کڕی گۆتی : دەبی ئەوشۆ لە کنە مـن میـوان بـی، نـابی بڕۆی. بازرگان گۆتی : ئەمن مارو سامانم وا لە بن رەشماریٚ بـە جـیٚ هیٚشـتیيە، لەگـەر خیٚزانەکەم ناتوانم لیٚرە بم. پاشا گۆتی : دوو پاسەوانی زۆر باشم هەیە دەیانیٚرم لە ویٚ بـن هەتا سبەینیٚ رازی بـوون. خلـەو بلـە چـوون لـە دیـار رەشمـاریٚ بازرگـانی لیٚـی دانیشـتن دەسـتیان بـە قسـان کـرد، خلـەو گـۆتی : ئـەریٚ بلـە وەرە سـەربردەی خۆمـان لـۆ یـەك بگیٚڕینەوە، بزانین ئەمە کوو گەیشتنیە ئیٚرە. ( بلە ) گۆتی برام بابم زۆر فـەقیر بـوو، لـە بەر دەستکورتی داکم چووە مارە دارتاشەکی ئیشـی بکـا، دارتـاش داکمـی بـردو ڕۆیـی نازانین چووە کیٚ ؟ بابم لە خەفەتان گوندەکەی بە جیٚ هیٚشت. برایەکی لـەخۆم گچـکەترم هـەبوو نـاوی (خلـە ) بـوو وەکـی لـە گـەر بابمـان ڕۆیشـتین، گەیشـتینە روبـارەکی بـابم برایەکـەمی پەرانـدەوە ئەوبـەری، هـات ئـەمنی بپەڕێنیتـەوە برایەکـەم گـورگ بـردی و ئەمنیش کەتمە ڕوباریٚ ماسیگر ئەمنیان گرتەوەو بە خیٚویان کردم، لەگـەریان ڕاوچیەتیم دەکرد . هەتا لە ژیانی خۆم بیٚزار بووم هاتمە ئەو شـارەی نـازانم داك و بـاب و بـرا چیـان لیٚهات .. بلە گۆتی : دەنا قوربان ئەمن بـرای توومـە وەکـی گـورگ ئـەمنی بـرد شـوان کەتنە دو گورگی ئەمنیان لە بەر دەوی گورگی دەرهینا، قەمپارەکی لە کەلەکەی دابووم لۆیان دەرمان کردم هەتا برینەکـەم چـاکبۆوە و، بوومـە شـوان ... ئـەوجا مـاریٚ خـوای ئاوابی وا بە یەك شادبوینە. بەشکو داك و بابمان ماینە ئـەوها ئـەوانیش ببینینـەوە ... دەستیان لە ملی یەك کرد تیٚـر گریـان و غـەریبیان هەسـتا، وەکـی ئـەوان ئـەو بـە سـەر هاتەیان گیٚراوە داکیان لە بن رەشماریٚ گیٚی لیٚبوو، دارتاش لە ناو تابوتە دارەکی نـابوو ( خلەو بلە ) گیٚیان لە تەقە تەقەکی بوو، بە جۆتـە هەسـتان چـوونە بـن رەشمـاریٚ دیتیـان ژنەك لە ناو تابووتە داری هاتە دەریٚ، بە غار لۆیان هات دەستی لـە ملـی هـەردووکان کردو گریا. گۆتی : هەی بە قوربانتان بم ئەوە لە کیٚ لۆ مـن پەیـدا بـوون. ئـەمن داکـی نگۆمە دارتاش دەست و پیٚی منی بەستاو بە تۆزی ئەمنی لە گەر خـۆی بـرد، لـەنگۆی

کردم. ئۆخەی خۆ پێتان دەکرێ تۆرەی خۆتان بکەنەوە، دارتاشی پارچە پارچە بکەن، سەریان بە کۆشی داکیان کرد خەویان لێکەوت. لە خۆشیان لەو وەختی بازرگان هاتەوە دەبینی هەردوو پاسەوان سەریان بە کۆشی ژنەکەی کردییە، چاوی چووە پشتی سەری یەکسەر گەڕاوە کۆشکی پاشای گۆتی : پاسەوانی نا پەسەندت هەیە، ئەوە هەردوکیان لەگەر ژنەکەم نووستینە، لێتان خۆش نابم. پاشا تورە بوو، گۆتی : بڕۆن بیانهێنن، ژنە لەگەر هەردوو کوڕەکانی چووە کن پاشای سەلامی کرد تەماشای پاشای کرد دری داخوریا، زوو ناسییەوە پاشاش ژنەکەی ناسییەوە نوتقی گیرا لە پڕ ژنە گۆتی : کوتەمەڕ ئەوە بویە پاشا ئەمەش بەو دەردو سەریەمان رابواردییە دەزانی بازرگان دارتاشی ناپاك و ئیبلیسە. بە تۆیزی ئەمنی فڕاند. ئەوانەش کورەکانمانن وا پاسەوانی پاشاینە نایان ناسییەوە پاشا دەستی بە گریانێ کردو لە هۆش کەت. بۆنیان هیناو بە پاشایان داکرد هەتا بە هۆش هاتەوە. گاسی خلەو بلەی کرد دەستی لە ملی کردن و سەربڕدەی هەموو پێ گێرانەوە، خەرکی شاری زۆریان پێخۆش بوو کە ئەو پاشایە باشە بە ژن و مندالی خۆی شاد بۆوە. ئەوجا بووە شایی و هەراو بەزم و ڕەزم پیرۆزباییان لە پاشا کرد، چوون ماری دارتاشی بە بارگەو بارخانەوە هەموویان هینا بە سەر فەقیرانیان دا بەخشی. قنارەکیان لە ناوەندی شاری لۆ دارتاشی هەربەست و لە قنارەیان داو تۆرەی خۆیان لێ کردەوە، ئەوانیش پێکشادبوونەوە ..

ئەمنیش هاتمەوە چیان نەدامێ .

# هێریله و فسۆس

هـەبوو نـەبوو ژنـەك و پیـاوەك هـەبوو ... ژنەكـە نـاوی ( هێریلـە ) بـوو؛.. پیاوەكـە ناوی(فسۆس) بوو . ژن و پیاوەكە گێلۆكـە بـوون، لـە سـەر ئـەوحارەش پیاوەكـە زۆر لـە ژنەكەی دەترسا. مریشكەك و سێ جوجكەیان هەبوو. هێریلە گۆتی : پیاوەكە ئاگات لـە ماریێ بی، دەچمە داران هەندەك دارو قەسەر لۆ زستانێ خڕ دەكەمەوە،ئاگات لە مریشك و جوجكان بـی، كـۆلارە زۆرە نـەوەك بیـاڤخوا. گـۆتی باشـە، ئـەتو هـەڕوە داران خـەمی مرێشـكت نـەبی، ژنەكـە چـووە داران، فسـۆس داوە بەنـەكی هینـا، سـەرەكی لـەپێی مریشكەكە بەست، سەرەكی لەپێی جوجكەكان بەست . لە پڕ كۆلارە هـات دنـدوكی لـە جوجكەكی دا، هەر چاریان پێكەوە راكێشا. فسۆس لە ترسی ژنەكەی زراوی چوو، چـووە ماریێ جیرانان گۆتی: عیلاجەكم لێ بكەن خێرتـان دەگـاتێ" هێریلـە هاتـەوە نـە فسـۆس دیارە نەمریشك و جووجكە. ژنە جیرانەكـەیان هاتـە كـن هێریلـە گـۆتی : نـابی دەنگـێ لەگەر فسۆسی بكەی، چونكە خوا ئەو مریشكەی لە نسیبەنگۆ بردبوو. هێریلـە گـۆتی : با بێتەوە چ قسان ناكەم. رۆژی دووەم دیسان چۆوە داران گۆتی فسۆس چ كەتنان نەكەی، ئاگات لە ماریێ بێ . فسۆس زۆری برسی بوو، نانـەكی هینـا لـە گـەر سـەلكە پیـازەكی بخوا، لە پڕ هێریلە هاتەوە نانەكەی فرێدا سەلكە پیازەكـەی لـە نـاو دەوی خـۆی نـا. لـە ترسان. هێریلە گۆتی : فسۆس ئەوە چییە ؟ رومەتت لۆ وەها ئەستوور بووە؟ ئەویش بـە لوغـە لوغ گۆتی : قونێری لێهاتییە . هێریلە گۆتی : چ بەرات لێنە بوو ئـەو قـونێرە كـو لە پرەكی ئەوها گەورە بووە . وەرە با بچینە كن تەبیبی لـۆت دەربكـا. ئـەویش گـۆتی: ناچمە كن تەبیبی. ژنە گۆتی : بینە بە خۆم لۆت دەربكەم، موسـەكی هێنـا بـە تـۆبزی

بەرومەتی داهینا و رومەت بریندار بوو سەلکە پیاز خرچەی هات. گوتی : هەی بە قوربانم بی ناپیاو ئەو پیازەت لۆ لە ناو دەوی خۆت نایە، بە جارەکی خۆت کەر کردییە. هێریلە هەتا مانگەکی هەر رومەتی فسۆسی تیمار کرد هەتا چاکبۆوە. ئەوجا هێریلە گۆتی : فسۆس لە بەرتوو لە ماریٚ بەسترایمەوە هەندەك دەچمە ماریٚ فاتمی جیرانمان ناگات لەخۆت بی.ژنەکە چووە دەریٚ فسۆس گۆتی : ئەو (گۆسکەی گۆزەلەی ) لە بێری پڕ ئاو بکەم، دەستنۆیژی پیٚ بشوم گۆزەلەکە لە دەستی بەربۆوەو شکا. ئەو جارە لە ترسان رۆیی لە ماریٚ چووە دەریٚ خۆی شاردەوە هەتا سیٚ رۆژان نەهاتەوە و، وەکی هێریلە هاتەوە گاسی کرد فسۆس، فسۆس دیار نییە. دەبینی گۆزەلە کەتیە شکایە. گۆتی : بە خوای گۆزەلەی شکاندییەو رۆیشتییە دەبی ئەوجارە لیٚی گەرێم، بەشکو تەمبیٚ دەبی، فسۆس لە چ جێیان نەدەحەواوە. گۆتی : با بچمەوە، ئەوە سیٚ رۆژە هەوکە لەبیری کردییە، خۆ سەرم نابڕی. چۆوە لە پەنای دەرکەی سەری راکێشا، ژنەکەی بە تەنیٚ دانیشتبوو. لە سەرەخۆ گۆتی : (( ئەزم ئەز نەبم ، گۆزەلەم شکاند گەورە نەبم، بێمە ژۆری یان لێرە بم )) ژنە گۆتی: ئەوە کیٚ یە؟ سەردەکێشی؟ دیسان گۆتیەوە، ئەوجا هێریلە گۆتی : هەی نا پیاو گوزەلەت شکاند بە ملی شکات لۆ هەراتی، وەرە ژۆریٚ وەرە لە بەر لۆمەی عالەمی نەبی نایەلم بێیەوە ئەو مارەی ... چەند رۆژەکی پێچوو جیرانەکەیان نەخۆش کەت، هێریلە چووە کنی. فسۆس گۆتی : با ئەمنیش لۆ خۆم بچمە دەریٚ بزانم لە ناو ئاوایی چ هەیە، دیتی لە پەنا دیواری حوشترەك راوەستایە، ئەو حوشترە ئی ماریٚ پاشای بوو لە حوشتران دابرابوو رێی بزر کردبوو. فسۆس گوریسەکی هینا لە ملی حوشتری بەستاو رایکێشا. گۆتی : هەتا هێریلە نەهاتیتەوە با سەری ببڕم، خۆی ئازا کرد حوشترەکەی سەر بڕی. لە ژۆریقۆرتەکی لێدا لە ناوی داناو شاردیەوە، لە بەر هێریلەی ژنی... وەکی هێریلە هاتەوە دیتی لە حەوشەی خین رژایە، گۆتی : فسۆس ئەو خینە چییە ؟ ئەویش لە ترسان گۆتی نازانم. ژنەکە گۆتی : دەبی پێم بڕێی ئەویش

گۆتی : چت لێ بشارمەوە، رانـە حوشـترەکمان بـە خێـر لـۆ هاتییـە دیـارە خینەکـە نـی گۆشتەکەیە ... سبەینی ماریێ پاشای بانگیان ڕاهێشت، گۆتیـان حوشـترەکمان بزربـووە ئەوەی ببینیتەوە خـەرات دەکـرێ، ژنـەکی زۆرزان هـەبوو گـۆتی : بـا بچـم بگـەڕێم ئـەو خەراتەی وەربگرم. لە ماران گەڕا، گۆتی کورەکەم زۆر نەخۆشە دەرێن بە گۆشت حوشترێ نەبی چاك نابیتەوە. کەس نـەیبوو چـووە مـاریێ هێریلـەی گـۆتی : هێریلـە قـەت پارچـە گۆشت حوشترەکی شك نابەی کوڕەکەم گەلە نەخۆشە سەرو بنی گرتیە بەو گۆشتەی نەبی چاك نابیتەوە. هێریلە گۆتی : قوربان ئەورۆ رانـە گۆشـتەکیان دایتـە فسۆسـی بـە خێـر، ئەوجا نازانم کێ خێری پێ کردینە. وەرە پشکەکی لێکـەوە ببـە. ژنـەش چـوو پشـکەکی گەورەی لێکردەوە، گۆتی: هێریلـە قـەت لـە چـاکەت دەرناچـم. ئـەویش گـۆتی: ئەیـەڕۆ چمنەتی تێدا نییە، یاخوا کورەکەی پێ چاکبیتەوە. ژنە گۆشتەکەی بردە مـاریێ پاشـای، ئاشکرابوو، بووە هەرا لە شاری. پاشا ئـەمری دا بچـن فسـۆس بگـرن، چـوون فسۆسـیان گرت، فسۆس هاواری دەکرد، کچێ هێریلە ئەمن کردم ئەتو نەکەی قەت ( چەپەرە ) ی بە جێبێلی ئاگات لە مـاریێ بـی. رۆژەك جیرانـی مـاریێ هێریلـەی بووکیـان دەگوزتـەوە، شاییەك دەگەڕا. هێریلە حەزی چووە شاییێ لـە دری خـۆی گـۆتی : بچـم زۆر عـەیبـە ، دەرێن مێردی گیرایە لە سەر دزی و دێتە شاییێ، ژنە جیران گاسی هێریلەی کرد، گـۆتی: وەرە بسوڕیەوە ئەمە جیرانین لۆ خۆت لە ژوریێ نایە؟ هێریلە گۆتی : خوا خێرت بنووسـی هەستا ( چەپەرە ) ی لێکردەوە بە گوریسـەکی لە پشتی خۆی قایم کـردو، چـووە شـایی. خەرکەکە دەستیان بە پێکەنین کرد. گۆتیان : ها هێریلە ئـەوە چییە ؟ گـۆتی وەسیەتی فسۆسی لە بیر ناکەم پێی گۆتم ئەگەر چوویە جێیەکی چەپەرەی لە بیر نەکـەی" لـە پـاش شایی هێریلە گۆتی : بابچم سەرەکی لەو پیاوەی بدەم، چشتەکی لـۆ ببـەم، بـزانم کـووە؟ شیوی لێناو لە پەرۆکەکی گرێدا چەپەرەی لێکردەوە لە پشتی خۆی هەرداو رۆیشت چووە حەپس خانەی. پۆلیسی پێش دەرکەی گۆتیان: ها خوشکم چـت دەوێ گـۆتی : پیاوەکـەم

گیرایه نانم لۆ هینایه چاویشم پیّ بکەوی بزانم ئیشی نییه گۆتیان ئەدی ئەوە چییە لە پشتی خۆت هەردایە؟ دەستی بە گریانی کرد. گۆتی : ئەی عەمرم نەمێنیّ وەکی پیاوەکەم چووە حەپسخانەی، گۆتی ئاگات لە ماریّ بی، چەپەرەی بە جیّنێلی، ئەمنیش قسەم نەشکاند چەپەرەم لەگەر خۆم هێنا. هەموو دەستیان بە پێکەنین کرد. گۆتیان وا دەچین لە بەر خاتری توو مێردەکەت بەردەدەین. هێریلە گۆتی: بە قوربانتتان دەبم قەت لە چاکەتان دەرناچم، با ئەویش تۆبەی بکا جارەکی دی چشتی ئەوها نەکا ... فسۆسیان بەردا هاتە دەریّ لە حەپسخانەی. گۆتی : هەزار جار تۆبە ئەمن ئیشی وەها نەکەم جارەکی دی خوایە زۆر مەمنونم لەو بەندەی ئەمنت بەردا. لە گەر هێریلەی چوونەوە ماریّ پێکەوە بە خۆشی رایانبوارد .

* کە مندالّ دەترسا، نەخۆش دەکەوت.

دەیانگوت: سەروینی گرتییە...

* چەپەرە = دەرگا

# مام باپیر

هەبوو نەبوو پیاوەکی بازرگان هەبوو ناوی ( پیربار ) بوو، سیێ کورو کیژەکی هەبوو، ناویان ( بایزو باپیرو پیرۆت ) بوو. کیژەکەش ناوی ( زێنێ ) بوو. مام پیربار ساری دوو جار سیێجار دەچووە وراتی عەجەمان لۆ کڕین و فرۆشتنێ. هەرجارە دە رۆژی پێدەچوو. مام پیربار وەختی سەفەری هاتبوو، جیرانەکیان هەبوو ژنەك و پیاوەك بوون، زۆر یەکدیان خۆشدەویست و لەگەریان یەك مار بوون ناویان سەعەو فاتێ بوو. مام پیربار چووە کنیان پێی گۆتن : دەچمە سەفەرێ دەبی ئاگاتان لە زینێ بی چونکە زینێ داکی نییە و، برایەکانی دەچنە ئیشێ، ئامانەتی ئەنگۆ بی. پلکە فاتێ گۆتی : بە سەر چاو لە کیژی خۆم زیاترە چ خەمت نەبی ... مام پیربار بە کوڕەکانی گۆت وەکی چوونە دەرێ خوشکتان ببەنە ماری پلکە فاتێ، باب سەفەری کردو رۆیی. دوو رۆژ بوو زینێ دەچۆوە ماری پلکە فاتێ، سەعە دری چووە زێنی لێی چووە پێش بە تەمابوو پڕکێشی بکا. کیژە گۆتی : هەی عەمرت نەمێنێ بابم ئەمنی بەنگۆ سپارد بیە ئەتوش ئەوها پیسی، هەی سەگ باب. سەعە وەکی گێی لەو قسانە بوو خێرا چوو بە برایەکانی گۆت : زێنی خوشکتان لۆ کوشتنی نەبی لۆ چیدی بە کەلك نایێ، رۆژەك دەبی سەرتان شۆڕ بکا. برایەکانی زۆر پێ تێکچوون، برای گچکە گۆتی : بە خوای دەیکوژم. برایەکانی دی گۆتیان : بە خوای ئەمە باوڕ ناکەین، خوشکی مە زۆر بە حەیایە هەتا بابم دێتەوە دەنگی لەگەر ناکەین. پیرۆت کە برای گچکە بوو، چوو بە دزی برایەکانی کوشتی و، قەبرەکی لێدا بە جلك و بەرگی بە خێن لە ناو قەبرەکەی نا. چوو گۆتیە برایەکانی ئەنگۆش خۆش. ئەوانیش دەستیان بە گریانی کرد، گۆتیان ئەو ئیشەت لۆ کرد، بە قسەی سەعەی. بابم بێتەوە ئەمە چ برێین؟ چەند رۆژی پێچوو باب هاتەوە، کورەکان بە

پیری وه چوون و ماندی نەبوونیان لێکرد. باب گۆتی: ئەدی کانی خۆشکتان؟ گۆتیان چووه ئاویٚ بێنی، هەر نەهاتەوه. باب گۆتی : خوشکتان چ لێکردیە؟ راستم پیٚ بڕێن. برای گەوره حارو مەسەلەی لۆ گێراوه. باب گەلەکی له سەری خۆی دا. گۆتی : کوتان زانی ئەو کیژەی بە کوشتن بدەن، هەر ئەلعان سەعەو پیرۆتی دەکوژم. پیرۆت وەکی گێی لەو قسەی بوو ( ده) لیرەو هەندە پارەی لە گەر خۆی بردو، سەری هەرگرت و رۆیی روی له شارەکی کرد کەس نەیناسی، تووشی پیٚریژنەکی بوو، گۆتی : پلکیٚ قەت ئەوشۆ جێم ناکەیەوه، کەسی ناناسم. پیرێژن گۆتی :کوڕم ئەتو له کیٚ هاتی؟ گۆتی : داپیره کەسم نییە، داك و بابم مردینه، سیٚ چار لیرەم هەنه له گەر خۆم هینایە ها دوانت بدەمیٚ. پیرێژن وەکی چاوی به لیرەی کەت خەنی بوو. گۆتی : ئەمنیش کەسم نییە ببە کوڕی من، لۆ خۆمان پێکەوه ئیشی دەکەین و دەخۆین. کوڕە دەستی ماچکردو مەمنونی بوو، کوڕه رێك کەت لەگەر داپیرەی. رۆژەك چووه سەربانی تەماشای دنیاییێی دەکرد، دیتی له ناوەندی زێی گردەکی برند دیاره چوو له داپیرەی پرسی ؟ ئەریٚ داپیره ئەو برندایییە چییە ؟ له ناو زێی دیاره؟ داپیره گۆتی : کوڕم ئەوه کۆشکی کیژی پاشایە. پیرۆت گۆتی: باشە ئەو کوشکه لۆ له ناوەندی ئەو ئاوەی کرایە؟. کوڕم پاشا کیژەك و برازایکی زۆر جوانی هەیە، نەیهێشتیە کەس بیانبینی، ئەو کۆشکەی له ناو ئەو ئاوەی دروستکردییە هەتا کەس نەیانگاتیٚ و کەس نەبینن. ئەویش له دری بووه مەرەق. گۆتی : ئەگەر نەمرم دەبی خۆم بگەینمە ئەو کۆشکەی. شەویٚ خۆی ماتکردو لیٚ ی نووست، هەتا سبەێنیٚ گۆتی : دایە قەت بزانە دوو سندوقی دارم لۆ پەیدا ناکەی ئەتو شارەزای. ئەویش گۆتی : به سەر چاو. کوڕە چووه ئیشیٚ و هەتا هاتەوه داکی دوو سندوقی لۆ پەیدا کردبوو. سندوقەکانی بردە سەربانی لەویٚ دەستی به ئیشیٚ کرد. چەرخ و فەلەکی باشی لیٚ دروست کرد. سواربوو، گۆتی: بزانم دەفڕیٚ؟ چەرخ و فەلەك بە ئیش کەت. کوڕە خەنی بوو گۆتی : با ئەوشۆ بڕوا بەرام سبەی شەویٚ دەچم. هەتا ئەو شەوو رۆژە

تەواو بوو وەخت بوو شێت بێ. شەو داهات بە دزی داپیرەی سواری چەرخ و فەلەکی بوو رۆیی، هەتا سەر کۆشکی گیر نەبوو. لە سە رکۆشکی‌نیشت لە سەر قاندرمان چووە خواریّ کەس هەست و خوستی نەبوو. ناو مار وها ڕازابووە هەر سەرت سوڕدەما، سەری بە ژووریّ داگرت کیژەك لە سەر تەختی راکشابوو. خەوی لێکەتبوو، هەر زێنەتکار بوو تەماشای بکەی. لە گەر دیتی عەشقی بوو، چوو لە تەنیشی پاریداوە دەستی لە ملی کرد. کیژە بە ئاگا نەهات. پیرۆت ئەنگوستیلەکی جوانی لە پەنجەی بوو لە گەر ئەنگوستیلەی کیژەی گۆرییەوە، ئەنگۆستیلەی کیژەی لە پەنجەی خۆی کرد، ئی خۆی لە پەنجەی کیژەی کرد، بەرەبەری بەیانیان بوو. گۆتی: با برۆم درەنگە، سەری بە ژۆرەکی دی داگرت کیژەکی دی خەوی لیکەوتبوو، ئەویش لەوی جوانتر بوو. ئەویشی ماچکردو بە جیّ ی هێشت، سوار بوو چۆوە کن داپیرەی. داپیرە سەری برند کرد، گۆتی : کوڕم ئەوە لە کیّ بووی، لە بەر توو خەوم لێنەکەتییە. گۆتی : دایە لۆ خۆم لەو دنیایەی دەگەڕام، سبەێنی کیژە لە خەویّ هەستاو چۆوە بە رنەینۆکی تەماشای خۆی کرد، دەستی بە سەرو پرچی خۆی داهێنا، چاوی بە پەنجەی خۆی کەت، ئەنگوستیلەی گۆرایە. گۆتی : خوایە کەس ناگاتە ئیرە لە پیرێژنەکی زیاتر لێرە خزمەتمان دەکا، ئەویش شەویّ لێرە نابی، کیّ هاتیتە ئێرە ؟ کیّ ئەنگوستیلەی لە پەنجەی مـن دەرهینایە ؟ چ دەنگی نەکرد لە دری خۆی هێشتەوە، شەوی دووەم دیسان هاتەوە ئەو شەویش بە ئاگا نەهات. بەارم کیژە هەستی کرد یەکەك هاتییە دەستی بە سەرو پرچی داهینایەو، لە تەنیشی پاریدایتەوە. گۆتی : با تەگبیرەکی بکەم پەنجەکەی خۆی بری و خێی پێداکرد هەتا خەوی لێنەکەوی" شەوی سێیەم کوڕ هاتەوە. کیژە هەستی ڕاگرت کوڕەك لە سەر قاندرمان هات لە جوانیان دری نەدەهات تەماشای بکا، هەر لە دوور خۆی بە باوەشی دادا گۆتی : ئەوە چەند شەوە لۆ گاست نەدەکردم؟ پیرۆت لە خۆشیان شاگەشکە ببوو. گۆتی : ئەوێرام واگات بینم ترسام لێم توڕەبی. کیژە گۆتی : قەت توڕە نابم، ئەمەلێرە حەپس

کراینه، کەس نابینین، کەس ناناسین : هەموو شەویّ وەره لۆ خۆمان هەر سێکمان گەمەو سوحبەتیّ دەکەین. پیرۆت ده رۆژان ئەو هات وچۆیەی دەکرد. رۆژەك پیرێژن گۆتی : ئەو چەند رۆژه ئەو کیژانەم نەکێشایه بزانم چەندن ؟ چونکه رۆژەك نا رۆژەك دەیکێشان. چوو هەردوکی کێشان گۆتی : ئەنگۆ له کورتیتان دایه مەسەله چییه ؟ گۆتیان مەسەله چ نییه مەسەلەی چ ؟ پیرێژن گۆتی : دەستتان لێدرایه لۆیی له کورتیتان دایه. کیژەکان تووره بوون، له گەر پیرێژنی به شەر هاتن. پیرێژن چوو شکایەتی له کن پاشای کرد. پاشا گۆتی : ئیّ تەگبیر چییه ؟ پیرێژن تەگبیری کرد سەربانی کۆشکیّ قیرێژ بکەن، ئەگەر هەر کەسەك بیّ بەو قیرەی وه دەنوسیّ. گۆتیان تەگبیرەکی باشه. چوون سەربانی کۆشکیان قیرێژ کرد، شەویّ چەرخ و فەلەك هات، کیژەکان نەنوستن، له پەنجەرەی دەستیان درێژ دەکرد لۆ پیرۆت دەیانگۆ : له سەر کۆشکیّ مەنیشه، پیرۆت له بەر فره فری گێی لێنەبوو، هەتا هەندەك خۆی نەوی کرد دیتی سەربانەکه رەش دەچی نازانی چییه ؟ هاواریان دەکرد دەیانگۆ له خواریّ بنیشه، ئەوجا پیرۆت له سەر بانیّ نەنیشت. له خواریّ له سەر رۆخی دیواری نیشت چۆوه ژۆریّ و دەستیان به گەمەی کردو، قسەی خۆش و خواردنی خۆش هەتا بەرەو بەری بەیانیان سواری چەرخ و فەلەکی بوو، هەندەك برند بوو دەستڕی لۆ کیژەکان هەرشەقاند ماراو بونیان لیّ بخوازی دەستڕ له دەستی کەته سەر کۆشکیّ، پیرۆت خۆی نوی کرد دەستڕی ڕاکێشاو، دەستڕ پارچەکی لیّ بۆوه به قیریّ وەنوسا، زۆر عێدز بوو زانی ئەو پارچه دەستره تووشی چشتەکیان دەکا. رۆیی چۆوه ماریّ پارچه دەسترەکەی له ناو دەلاقەی دانا. پیرێژن سبەینیّ هات چۆوه کۆشکی پارچه دەستڕی دیتەوەو، خەنی بوو. له دری خۆی گۆتی : نەم گۆ پیاو بێره فێربووه چوو خەبەری لۆ پاشای برد. پاشا گۆتی : له بەینی عەردو عاسمان بی ساحێبی ئەو پارچه دەسترەم دەویّ. پیرێژن گۆتی : خەمت نەبی له بەینی نارو بزماری بی دەیبینمەوە، کو ئەو ئیشەم ئاشکرا کرد ئەوهاش ئەوەت لۆ

پەیدا دەکەم. جاریٚ چ دەنگان مەکە. پیریٚژن زۆرزان بوو خۆی کردە دەرۆزەکەر چوو لە ماران گەرا، گەیشتە ماریٚ داپیرەی پیرۆتی گۆتی : فەقیرم زۆرم برسییە قەت پاروە نانەك نییە بمدەیێی، داپیرە گۆتی : دانیشە بە سەرچاو، هەتا داپیرە چوو نانی لۆ بینی زوو هەستا تەماشای ناو مارەکەی کرد، پارچە دەستری لە دەلاقەی دیتەوەو، لە ناو بەرکی خۆی نا. لە داپیرەی پرسی : ئەتوو بە تەنیٚی ؟ گۆتی : وەللاٚ هەر تاقە کوڕەکم هەیە، ئەویش وا لە ئیٚشیٚیە هیٚشتا نەهاتیتەوە. گۆتی : شەوانیش نیشیٚ دەکا؟ داپیرە گۆتی : لۆ وەها دەپرسی ؟ ئەتو فەقیری یان لە بەحس و خواسان دەگەریٚی؟ گۆتی: هەر لۆخۆم ئەوها دەریٚم، هەستا رۆیی. پیرۆت هاتەوە تەماشای کرد پارچە دەستر نمایە. لە داکی پرسی : دایە کەس هاتیتە ئیٚرە ئەورۆ؟ ئەویش گۆتی : وەللاٚ کوڕم تازە پیٚریژنەکی دەرۆزەکەر هات، گۆتی : برسیمە ئەمنیش نان و ماستم لۆ هیٚنا، بە هوردو باریکی لە منی دەپرسی ؟ ئەریٚ ئەتو بە تەنیٚی و کەست هەیە، کوڕت هەیە، پیرۆت تیٚگەیشت دەیزانی کەر لە کیٚ کەتییەوە کوندە لە کیٚ دڕایە. گۆتی : با تەگبیرەکی بکەم هەندەکی پارە هەبوو نیوەی دا داپیرەی. گۆتی : ئەمن دەچمە سەفەریٚ ئەوەك نیٚمەوە ئەو پارەیەت بدەمیٚ. گۆتی: کوڕم قەت تازە بیٚتو ناژیم، نابی بەجیٚم بیٚلی، لەگەر خۆت ببە. گۆتی : دایە هەر سەرت لیٚ دەدەمەوە. مارەوایی خواست و دەستی ماچ کردو رۆیی. پیریٚژن دەستی بە گریانیٚ کرد، سواری چەرخ و فەلەکیٚ بوو بەرەو کۆشکیٚ چوو. لەویٚ نیشت خەبەری برد لۆ کیژەکان. گۆتی : حارو مەسەلە ئەوهایە، ئەوجا ئەمن وا دەرۆم ئەگەر لە گەرم دیٚن وەرن سوار بن، دەنا پاشا سەرمان دەبڕی. کیژەکان کە ناویان ( شەنگی و شۆخیٚ ) بوو هەردوکیان گۆتیان : وەللاٚ هەردوکمان لە گەرت دیٚین، چونکە پاشا سەری مە پیٚشی تۆو دەبڕی. چەند پارەو زیٚڕو دوڕو یاقوتیان هەبوو هەموویان لە گەر خۆیان بردو، سواربوون و رۆیشتن. هەتا دوورکەتنەوە لە شاری روویان لە شاخ و داخان کرد، کیژەکان گۆتیان : زۆرمان برسییە و زۆرمان سەرمایە. پیرۆت گۆتی : باشە هەوکە لە

قەد شاخەکی دەنیشین چارەکی دەکەین، خواردنیان لە گەر خۆیان هینابوو، چەرخ و فەلەك نیشت و هاتنە خوارێ دانیشتن. پیرۆت گۆتی : ئەمن دەچم ئاگرەکی پەیدا دەکەم. گۆتیان : باشە سواربوو فڕی لە سەر شاخی تریسکە ئاگرەك دیاربوو، نێزیك بۆوە دیتی شوانەك وا ئاگری دەکاتەوە. هاواری کرد هۆ هۆ کاکی شوان پشکۆ ئاگرەکم لۆ لە ناو پەرۆکەکی دانێ لۆم باوێ، ئاگری پێ دەکەینەوە. شوانەش پشکۆ ئاگرەکی بێ پەرۆ هاویشت بە چەرخ و فەلەکی کەت، ئەویش چونکە دار بوو ئاگری تێبەربوو سووتا. کوڕە لە سەڕرا هاتە خوارێ و لە خۆچوو هەتا بەیانیان بێهۆش کەت. وەکی چاوی هەرینا بە خۆ هاتەوە دیتی وا لەو گۆرەی کەتییە. شوانەش لە دیاری دانیشتییە. لە شوانەی پرسی: ئەری ئەتو لۆ وەهات لە من کرد ؟ خۆ دوژمنی توو نەبووم. گۆتی : بە خوای کاکە ئەمزانی دەبی لێم خۆشبی. پیرۆت گۆتی بە خوای لێت خۆش نابم هەتا مەڕەکم نەدەیێی. شوانە گۆتی: قەت مەڕت نادەمێ. گۆتی : ئەگەر نەمدەیێ دەتسوتێنم چونکە چەرخ و فەلەکت لێ سوتاندم، دوو کیژم لە دەست چوو نازانم چییان بە سەر هاتییە؟ ئەو غەریبانە نەکەس دەناسن نە چ جێیان پێ دەزانن. شوانەش ناچار بوو مەڕەکی دایێ. گۆتییە شوانەی سەری ببڕە گۆشتەکە لۆ خۆت پیستەکەش لۆ من . مەڕەی سەر بڕی و پیستەکەی دا پیرۆتی. پیرۆت پیستە مەڕی لە خۆی وەرپێچاو رۆیی، لەو شاخی لۆ ئەو شاخی لەو دۆرو زورگ و تەلان گەڕا کیژەکانی نەدیتەوە نەیزانی لە کێی بە جێ هیشتبوون، دەستی بە گریانی کرد. گۆتی : لە نێوچەوانی من ئەوانە ئەوهایان بە سەر هات، سەری خۆی هەرگرت و رۆیی روی لە شارەکی کرد. ماریێ پاشای دەگەران لە یەکەکی باش بیکەنە شوان. پیرۆت چوو گۆتی : ئەمن فەقیرم دەبمە شوان. گۆتیان ئەتو شوانیت پێ دەکرێ؟ گۆتی : زۆر باشم پێدەکرێ. کردیانە شوانی ماریێ پاشای. پاشا سێ کیژی زۆر جوانی هەبوو، رۆژی داخوازی کەریان دەهات بە کەس رازی نەدەبوون، وەزیری دەستەراست گۆتی : پاشام خۆشبی ئەمن تەگبیرەکی دەکەم ئەگەر ئەتوو رازی بی. پاشا

گۆتی : فەرموو. وەزیر گۆتی : شاری برازێنینەوە، خەرکی شاری هەموو خڕبینەوە، شایی و هەرایەکی خۆش بکەن، چەند کوڕە گەنجی شاری هەموو خڕبکەنەوە بێن ڕاوەستن، ئەو کیژانەی توو بە خۆیان یەك و کوڕ هەربژێرن و دیاری بکەن. پاشا ڕازی بوو بە ئەمری وەزیری شاریان ڕازاندەوە و، خەرکی شاری هەموو خڕبونەوە، کوڕەکان جلك و بەرگی خۆیان گۆری، تەوالێتی خۆیان داهیناو، بووە هەراو لە شاری. کیژەکانی پاشای خۆیان ڕازاندەوە لە سەربانی ڕاوەستان هەریەکە سیٚ سێوی بە دەست وەگرت، هەتا ئەو سێوانە لەو کوڕەی بدەن وەکی بەدری خۆیانە. مۆزیقە لێدراو کیژی گەورە سێوی خۆی هاویشت بە کوڕی وەزیری دادا، دەم و دەست لێیان مارە کرد. کیژی ناوەنجی سێوی هاویشت لە کوڕی قازی دا، ئەویش مارە کرا. کیژی گچکە سێوی هاوێشت، لە سینگی شوانەی دا، هەموو چاویان زەق کردەوە. گۆتیان ئەوە خواربوو با ئەوجارەش سێوی باویٚ، دیسان هەر لە شوانەی دا. پاشا گۆتی : کو دەبی شوانی خۆم نە دەیناسم نەدەزانم کوڕی کێیە ؟ کیژی خۆمی بدەمیٚ. سێوی سێەمیش هەر لە شوانەی دا. پاشا گۆتی : پێی ناویٚ مارەی بکەن بە ئارەزوی خۆیتی. کورەیان گاسکرد گۆتیان ناوت چییە ؟ گۆتی : ناوم پیستە مەڕە، کیژەیان لیٚ مارە کرد. پیستەمەڕ لە دری خۆی پێی ناخۆش بوو، چونکە هەر چاوی لە ( شەنگی) بوو. لە بیری نەدەکرد، بەرام چاری بیٚ چاریبوو، مارەی کردو گۆزتیەوە. کیژەکان هەرکەسە چونە ماریٚ خۆیان. ڕۆژەك خوشکی گچکە گۆتی با بچمە ماریٚ خوشکەکانم سەردانەکیان بکەم. چووە ماریٚ خوشکان ئەوانیش تێر پێی پێکەنین، گۆتیان: ها ژنی پیستە مەڕی لە چ دەگەڕێی ؟ ئەویش هەستا هاتەوە گۆتی : جارەکی دی نایەمە مارتان، چۆوە بە عێدزی دانیشت. پیرۆت لێی پرسی لۆ وەها عێدزی ئافرەت؟ گۆتی: خوشکەکانم قەشمەریم پیٚ دەکەن دەرێن ژنی پیستە مەڕی. گۆتی: ئافرەت وەرە دانیشە سەربردەی خۆمت لۆ بگێرمەوە، ... ناوم پیرۆتە ناوم پیستە مەڕ نییە، بە سەر هاتی خۆی هەموو لۆ گێراوە، ئەمن بابم دەورەمەند بوو قەت شوانیم

نەکردییە وا لێرە ناچارم، بەرام خەمت نەبی رۆژەك دادێ ئەتوش تـۆرەی خـۆت بکەیـەوە پێیان پێ بکەنی. پاشا نەخۆش کەت چەند تەبیب و حەکیمیان هینا لۆ پاشـای. گۆتیـان بە گوشتاوی (          ) چاك بیتەوە، ئەو (          )  لـە فـران دارسـتانی هەیـە و کەسیش ناگـاتێ. پاشـا گـۆتی: ئـەدی زاوام لـۆ چـێیە ؟ دەبـی بچـن لـۆم پەیـدا بکـەن. ئەوانیش گۆتیان: بە سەر چاو" هەردوکیان رۆیشتن. لە نێوەی رێیی تووشی پێسـتەمەڕی بوون چاك و خۆشیان کردو گۆتیـان: هـا پیسـتە مـەڕ خێـرە هاتییـە ئـەو رێیـە دوورەی؟ گۆتی: ئەنگۆ لۆ چ دەچن ئەمنیش لۆوەی دەچم. کردیانە قاقـای پێکـەنین. هـەی هـەتیم ئەتوو و ئەو ئیشەیان گۆتییە گۆتی : دەبرۆن با بزانین چ دەکەین، رۆیشتن نێزیك بوونـەوە لە دارستانی پیستەمەڕ گۆتی: وەرن گرۆی بکـەین ئـەوانیش گۆتیـان گـرۆی چ ؟ ئەگـەر ئەنگۆ ئەو تەیرەتان گرت، ئەوە مۆری خۆتان لە من بدەن. ئەگەر ئـەمنیش گـرتم، ئـەوە مۆری لەنگۆ دەدەم. ئەوانیش بە پێکەنینەوە گۆتیان : باشە، باوەڕیان نـەدەکرد کـە ئـەو ئیشەی پێ بکرێ. گەیشتنە نـاو دارسـتانی گـەران هـەتا تـەیرەیان دیتـەوە. لـە دوویـان غاردا، ها لێرە هالەوێ تـەیرە دەفـڕی، لەسـەر داران دەنیشـت، هـەردوکیان بـە هـەموو ئەقری خۆیان لە دوویان غاردەدا، ئەدار لاستیق نـە بـەردەقانیان پێبـوو. دەچـوونە سـەر دارەکەی تەیرەکە لەوێ هەر دەفرێ، هەتا باش هیلاك بوون. پیستەمەڕ خۆی تێـك نـەدا لە سەرەخۆ هاتە پێش گۆتی : وەرنە ئەو لایە هەی نامەردینە، تەیرەکەش ماندی ببـوو، پیستەمەڕ خۆی تێهەردا سەرداری، لاقی تەیرەکەی گرت. گۆتی: یللاّ ئەنگوستیلەی خۆم سۆردەکەمەوە لاقونتان پێ داخ دەکەم، دەنا بەخۆم لۆ پاشای دەبـەم دەرێـم ئـەمن گـرتم. گۆتیان : وەرە ئەتوو مەچوو، بدەمە بە خۆمان دەبەین. پیستەمەڕ گۆتی : هەتا مۆرتان نەکەم ناتان دەمێ، بە تەمابوون بیفرێنن و هەرێن، هەنـدی کردیـان دەسـەراتیان نـەبوو. ئەیانتوانی بیفرێنن. ناچار بوون مۆریان لە خۆدا. ئەوجا رۆیشتن، تەیرەیان لۆ پاشای برد. ئەویش گۆشتەکەی خـواردو بـە گۆشـتاوەکەش بـەدەنیان چـەورکردو چـاکبۆوە. کیـژەکان

چوون سەر لە بابیان بدەن. پیستەمەڕ گۆتیە ژنی خۆی ئەگەر خوشکەکانت پێیان گۆتی ژنێ پیستەمەڕی، ئەتوش برێ ها ژنی قۆن بە مۆرێ. شەوێ چۆوە ماری بابی خوشکەکانی گۆتیان ژنی پیستەمەڕی هات. ئەویش گۆتی وس بن ئەنگۆش ژنی قوون بە مۆرینە. پیستەمەڕ ناوی ( پیرۆت بەگە) ئەوان لە جێی خۆیان سارد بوون تەماشای یەکیان کردو دەنگیان نەکرد چوونەوە ماریێ گۆتیانە مێردەکانیان وەرن بزانین خوشکی گچکە ئەوهای پێ گۆتینە ئەوە چێی ؟ پێمان بڕێن. ئەوانیش گێرایانەوە. گۆتیان با کەس نەزانی چیدی وەی پێمەڕێن. با سەرکەچەرو بن کراوبی. ئەوجا نەوێران چیدی قسان بکەن پیستەمەڕ گۆتییە خێزانەکەی باش لە بەسەرهاتی من تێگەیشتی. ئەگەر لەگەرم دێی وەرە با برۆین ئەگەر لەگەرم نائێی بە خوای ئەمن دەرۆم لەو شارانە دەگەرێم هەتا ئەو دوو کیژەی دەبینمەوە. بزانم ماینە مردینە چیان لێهاتیە. ژنە گۆتی: ئەمن لەگەرت نائێم ئەتوش کەیفی خۆتە. پیرۆت مارئاوایی کردو، رۆیشت. ژنەکەی بە جێ هێشت ...

وەکی پیرۆت کیژەکانی پاشای بە جێ هێشت، ئەوانیش هەر چاوەڕێی کوڕەیان دەکردو، نەهاتەوە شەویان بە سەرداهات. زۆر ترسان خۆیان لە پەنایان ماتکرد. هەتا رۆژیان لێهاتەوە زۆریان برسی بوو. هەستان رۆیشتن لەرێو بانان پیاوەکیان لێ بە دیار کەت. هەردوکیان غاریان دا خۆیان گەیاندێ. دیتیان پیاوەکە هێسترەکی رازاندبۆوە، لە متوو مێرو بازنۆکەو زەنگیانەی هۆنراوەی جوان جوان، لێی چوونە پێش لێیان پرسی: مامە ئەتو چی‌و لە کێ هاتی ؟ گۆتی : ئەمن دێوەرەم و گەرۆکم دەگەرێم، شتی دەفرۆشم. گۆتیان مام دێوەرە دەبینە کیژی توو، کەسمان نییە زێرو پارەمان زۆر پێیە دەتدەینێ. دێوەرە لە خۆشی پارەو زێری خەنی بوو. جلکەکەی لەگەر خۆی بردن. کیژەکان داوای دوو دەستە جلکی شڕو وڕیان کرد. خۆیان دا دێوەرەی جلکە شرەکەیان لە بەر کرد، پارەو زێریان دا دێوەرەی هەندەکیان شاردەوە گۆتیانە دێوەرەی دەبی خانیەکمان لۆ پەیدا بکەی لە گەر نۆبەدارەکی چمان لە توو ناوێ، بەرام خانیەکە دەورێ بی. ئەمەش ئیشی دەکەین

و یاری تووش دەکەین. نانەکی پەیدا دەکەین. دێوەرە خانی و نۆبەداری لۆ گرتن. کیژەکان نۆبەداریان گاسکرد گۆتیان: وەرە ئەو ئیشەمان لۆ بکە بیست لیرەت دەدەێنی، دوو رسمان هەیە لە سەر کۆشی خۆت دانێ. گۆتی : بە سەر چاوان لۆتان دەکەم. هەرکەسەك هات و تەماشای ئەو رسمەی کردو گریا، ئەو کەسەمان لۆ بگرە و لە ژۆرێی بکە. کیژەکان رۆژێ ئیشیان دەکردو، یارمەتی دێوەرەیان دەداو، زۆر ماندی بوون، چونکە فێری ئیشکردن نەبوون، چەند رۆژەك نۆبەدار لە سەر رێی دادەنیشت ئەو رەسمەی لە سەر کۆشی خۆی دادەناو رەسمەکان یەك پیرۆت بوو یەکیش هەردوو کیژەکان لە گەر پاشای بوون. هەتا رۆژەك پیاوەك بە تاقە سوارە بەو رێیە داهات دیتی پیاوەك دانشتییە دوو رەسمی لە سەر ڕانی خۆی دانایە. لە ئەسپێ دابەزی تەماشای کرد کوڕەی ناسی یەوە دەستی بە گریانی کرد. پرسی: کوڕم ئەو رەسمەت لە کێ بوو؟ نۆبەدار زوو هەردوو دەستی بەستاو رایکێشا و لە ژۆرێی کرد. چوو خەبەری لۆ کیژەکان برد گۆتی : پیاوەکم گرت وا لە ژۆرێ دەرکەم لە سەر پێوەدایە. گۆتیان: باشە ئەتو لێی گەڕێ هەڕۆوە دوو ئیشی خۆت. هەردوکیان خۆیان پێچاوە دەم و چاوی خۆیان داپۆشی و چوونە ژۆری کن پیاوەکەی. لێیان پرسی: مامە ئەتوو لە کێ هاتی و لۆ لە دیار ئەو رەسمەی گریای ؟ ئەویش سەربردەی کوڕەکەی لۆ گێراوە. تومەز بابێ پیرۆتی بوو. وەکی ناوی لە خۆی نابوو پیستەمەڕ کیژەکان گۆتیان مامە خوا گەورەیە خەمێ مەخۆ هەر دەی بینینەوە. دوو رۆژی پێچوو پیاوەکی دی بە سواری هات گەیشتە کن کوڕەی هەروەستەی کرد. گۆتی کاکە چییە ؟ ئەویش رەسمەکەی پێ پیشان دا، چاوی بە رەسمەکەی کەت، بە توڕەیی لە ئەسپی دابەزی و گۆتی: ساحێبی ئەو رەسمانە دەناسی؟ کوڕ. گۆتی : نایان ناسم. پاشا گریا گۆتی : ئەدی ئەو رەسمەت لە کێ بوو؟ وەکی دیتی گریا سێ و دووی نەکرد پاشای راکێشاو بردییە ژۆرێ دەرکەی لە سەر کلیل دا. وەکی شەنگی و شۆخێ هاتنەوە نۆبەدار غاری دا گۆتی : پیاوەکی دیم گرت. ئەو پیاوەش پاشای بابی شەنگێ

بوو و مامی شۆخیێ بوو. شۆخی چوو به دزی له پەنا دەرکەی تەماشای کرد، دیتی مامی بوو. به غار چووه کن شەنگی گۆتی : کچی بابت هاتییه، هەردوکیان له خۆشیان دەستیان به گریان کرد. دیسان خۆیان داپۆشی و چوونه کنی لێیان پرسی ؟ مامه ئەتو لۆ کەتیه ئێره ؟ له بەر چ لۆ نەو رەسمانه گریای ؟ مامه به سەرهاتی لۆ گێرانەوه، ئەوانیش غەریبیان هەستاو دەستیان به گریانی کرد. بەرام خۆیان ئاشکرا نەکرد گۆتیان مامه ئەگەر بیانبینیەوه ئازاریان نادەی. مامه گۆتی : ئەگەر هەر کەسەك بیانبینیته وه به لیرەی دەیانکێشم. سیێ رۆژی پێچوو ئەو جاره پیرۆت هات به پێیله دەرۆیی ماندی و مردی و برسی و تێنی عیدز، سەلامی له کابرای نۆبەدار کرد، ئەویش سەلامی وەرگرتەوه گۆتی : ها کاکه دەرێی زۆر ماندی؟ ئەویش له تەنیشتی دانیشت، رسمەکانی دیت توند کابرای گرت گۆتی : ئەو رەسمانەت له کیێ بوو و له کێت هینایه. نۆبەدار پێی نەکرا ئەوی بگری دەسەراتی پیێ نەدەشکا گۆتی: وەره برۆ بچینه ماریێ، ئەوجا بپرسه. پیرۆت له گەری چوو گۆتی : فەرموو برۆ ژۆریێ چووه ژۆریێ و دەرکەی له سەر کلیل دا. پیرۆت دیتی وا بابی له ژۆریێ دانیشتیه، خۆی پێدادا و دەستی له ملی کرد و گریا. کوره بەسەرهاتی خۆی لۆ گێراوه. کیژەکان هاتنەوه خۆیان داپۆشی و چوونه ژۆریێ پیرۆتیان دیت گەشانەوه. گاسیان کرد وەره دەریێ بزانین ئەتو لو چ دەگەرێی هاتییه ئێره؟. ئەویش گۆتی : حارو مەسەلەی من دورو درێژه و دووکار مامزم بزر کردییه ئەوه چەند مانگه وەخته شێت بم و ئاگام له خۆ نییه، نازانم چییان به سەر هاتییه؟ مانه مردینه؟ دەبی هەر لەو دنیایەی بگەرێم هەتا دەیانبینمەوه، ئەگەر نەمدتینەوه خۆم دەکوژم . ئەوجا سەرپۆشیان له سەرخۆ لابرد، دەستیان له ملی کرد. پیرۆت شاگەشکه بوو. له خۆشیان گۆتی : ئەوه چتان لێهات و چتان به سەر هات؟ هەموویان بۆ گێراوه و دەستیان گرت چوونه کن بابیان، خۆیان ئاشکرا کرد پاشا دەستی له ملی کردن و پێك شادبوونەوه، کیژی خۆی له پیرۆتی ماره کرد و، برازای خۆی له برای پیرۆتی و چوونەوه جیێ و رێی خۆیان. شاییەکی خۆشیان کردو به خۆشی و شادی هەموو لایەکی. ئەمنیش کراسم درا چم پیێ نەبرا .

# لاچەقینکرە

هەبوو نەبوو پاشایەك هەبوو، سێ ژنێ هینابوو منداریان نەدەبوو. رۆژەك دەورێشەك دەگەڕا لە مارێ پاشای ناوبانگی ئەو پاشایەی زانیبوو کە پاشایەکی زۆر باشە و وجاغ کۆرە. مارێ پاشای دیتەوە و لە دەرکەی دا گۆتی : دەمەوێ چاوم بە پاشای بکەوی، خەبەریان دا پاشای گۆتی : با بێت. چووە ژۆرێو سەلامی کردو، گۆتییە پاشای: تەماشای ناو چاوت بکەم دەزانم مندارت دەبی یان نا ... ئەوجا سێ سێوی لە باغەری دەرهینا، و دایە دەست پاشای. گۆتی: لەگەر خێزانەکانت بخۆ، خوا وچاغت رۆن دەکا، بەرام هەتا ئەمن دێمەوە ناویان لێمەنێ، سار بسورێتەوە دێمەوە و ناو لە مندرەکان دەنێم دەورێش رۆیی ئەوەندەی پاشا حەولی دا گۆتی لە کنمان بە، ئەو بزر بوو. خەرکەکە گۆتیان : درۆیێ دەکا سێو چییە ؟ وا لۆ خۆی ئەو قسەی کرد، هەتا چشتی بدەیێ پاشا چۆوە مارێ ژنی گچکەی چووبۆوە مارێ بابی . دوو سێوی دا ژنە گەورەکان. سێوەکی کردە دوو کەرت کەرتەکی خوارد، کەرتەکی لۆ ژنی گچکە هەرگرت. ژنەکان هەردووك سەریان سوڕمابوو، وەختی سێوی نەبوو، قەت سێوی ئەوها بە تامیان نەخواردبوو. لە پاشایان پرسی: ئەو سێوانە چ بوو؟ پاشا گۆتی: دیاری بوو لۆم هاتبوو، ژنی گەورە پڕی دا کەرتە سێوی ئەویشی خوارد، دارکەکەی فرێدا، پاشا تووڕە بوو. گۆتی: ئەوەت لۆ خوارد؟ لۆ ژنی گچکەم هەرگرتبوو. ژنە هاتەوە بۆنی سێوی کرد، دارکەکەی لە قاپی کەتبو، دارك و قونکە سێوی خوارد. نۆ مانگ و نۆ رۆژە تەواو بوو، ژنە گەورەکان ناویان ( ئەسمەرو خەزار ) بوو. یەك و کوڕیان بوو ژنی گچکە ناوی (خاسێ) بوو کەرتە کوڕەکی بوو، چونکە سێوی نەخواردبوو. خەبەریان لۆ پاشای برد، سێ کورت بووە، پاشا لە خۆشیان خەزێنەی شکاند کردییە خێرو شایی و هەرایەك لە

شاری دەستی پێکرد، چەند رۆژان عالەم دەستی لە ئێشی هەرگرت، هەر شایی بوو. پاشا گۆتی : ناویان لێ نانێم هەتا دەورێش دێتەوە. منداڵەکان چلەیان چوو ناویان نەبوو، رۆژەك دەورێش بە دیارکەت، هاتە کن پاشای پیرۆز بایی لێکردو، گۆتی : بە خێر ناویان چییە ؟ پاشا گۆتی : ئەمن لە سەر قسەی توو راوەستایە . دەورێش گۆتی: دەبی ئەو مەلۆتکانە بیننە دیوەخانێ، لێرە دوعایان بە سەردا دەخینم و ناویان لێدەنێم. دوو مەلۆتکەیان هێنا. دەورێش گۆتی : ئەدی ئەوەی دی؟. گۆتیان : داکی نەیهیشتیە توورە بووە لە دەورێشی، چونکە سێوی ساغی لۆ نەناردییە. دەورێش وەکی ئەو قسەی زانی هەستا بە خۆی چووە کن خاسێ و، سەلامی کرد. گۆتی : خوشکم کانی کوڕەکەت بینە دەیبەمە دیوەخانێ، ئەویش گریا گۆتی : مام دەورێش کوڕی من نەقوستانە، کەرتکە کوڕە، چ دەیبەیە دیوەخانێ؟ دەورێش گۆتی : خەتای پاشای بووە، بەرام کاری خوایە، دیارە بەشی توو ئەوەندەبووە. بە خوای ئەو کەرتکە کوڕە بە دە کوڕان دەبی لۆ توو، چ خەمت نەبی. دوعای لۆ دەکەم لە هەردوکان ئازاتر بی. ئەوجا دەورێش مەلۆتکەی بردو چۆوە دێوەخانێ ناوی لێنان ( ئەحمەد و محەمەد و مەحمود ) مەحمود بە ( لاچەقینگر ) گاسی دەکرا .. کوڕەکان گەورە بوون رۆژەك پاشا بە کوڕەکانی گۆت: ئەگەر مردم سێ شەوو لە سەر قەبرەکەم نۆبەتی بگرن. پاشا ئەمری خوای کردو کفن و دفن کراو شاردیانەوە. قەبرستانیان لە تەو چیای بوو، ئێوارە داهات لاچەمگر بە برایەکانی گۆت: با هەر شەوەی یەکەکمان بچین نۆبەتی لە قەبری بابمان بگرین، ئەحمەد و مەحمەد گۆتیان: دەبرۆ ئەتۆش خۆت بە پیاو دەزانی بچی نۆبەتێ بگری؟ ئەحمەد گۆتی: ئەمن شەوی یەکەم دەچم ... ئەحمەد بە سواری و نەفەرەکی لە گەر خۆی بردو چووە سەر قەبران لێی دانیشت، گرمە گرمەك هات سەری برند کرد هەورەکی رەش پەیدا بوو لە کن ئەحمەدی بە عەردی کەت، دێوەکی رەشی گەورە برماندی گۆتی: ئەحمەد لە عاسمانانم دەویستی لە عەردی بە دەستم کەتی، پەلی گرت و فڕاندی بردییە ناو ئەشکەفتێ. ئەحمەد هەر نەوێرا

نووقەی بکا، سوارەکەی لە گەری بوو بە خێرای تێی تەقاندو خەبەری لۆ محەمەدی برد. محەمەد چەند سوارەکی لەگەر خۆی بردو رووی لە ئەشکەفتێ کرد. گۆتییە سوارەکان ئەنگۆ خۆتان لە پەنای مات بکەن، هەتا دێوەکە دێتەوە، وەکی هاتە ناو ئەشکەفتێ لە پاش سێ سەعاتان چاوەرێی من بکەن، ئەگەر نەهاتمەوە ئەنگۆ برۆنەوە، ئەگەر دێوەشم کوشت ئەوە لەگەر ئەحمەدی دێمەوە. گۆتیان : باشە محەمەد چووە ناو ئەشکەفتێ دیتی کیژەك دانیشتییە، دەرێی مانگە شەوق دەداتەوە، بە زنجیری بەسترایتەوە. لێی چووە پێش و پرسی : ئەرێ ئەتوو لێرە چ دەکەی ؟ کیژە گۆتی : ئەرێ بەخت رەشی ئەمن گرفتاری دەستی دێوان بووم، ئەحمەدی برات وا لە ژۆرێ زنجیرکرایە، کەس بەو دێوەی ناوەستی، برۆ بە کێ داهاتی بگەرێوە، هەتا دێوەکە نەهاتیتەوە. محەمەد گۆتی : نارۆم هەتا ئەحمەدی برام نەبەمەوە.. گرمە گرم هات، کیژە گۆتی : خۆت بشارەوە. خۆی لە پەنای ماتکرد. دێوە بە ژۆرێ کەت، چووە کن کیژەی لێی پرسی کێ هاتیتە ئێرە ؟ بۆنی بێگانان دێ، محەمەد خەنجەری دەرینا لۆ دێوەی، دێوەکە خۆی پێداداو گرتی، ئەویشی بە زنجیری بەستاوە. سوارەکانی لەگەر محەمەدی هاتبوون هەر چاوەرێی محەمەدیان کرد لە ئەشکەفتێ نەهاتە دەرێ. دیتیان دێوەکە لە ئەشکەفتێ هاتە دەرێ بە گرمە گرم بووە هەورەکی رەش چووە عاسمانێ. ئەوجا سوارەکان رۆیشتن، وایان زانی محەمەد خورایە چوونەوە خەبەریان بردەوە لە مارێ پاشای بووە تازییە. لە شاری هەموو بەرگی رەشیان لە بەرکرد. لاچەقینگرە هات لە ناو خەرکی هاواری کرد. گۆتی : ئەمن دەچم یان سەری خۆم لە سەر دادەنێم، یان تۆرەی برایەکانم دەکەمەوە. هەموو گۆتیان وەرە دانیشە با ئەتوش نەکوژرێی، چت پێ دەکرێ؟ بە تەمای ئەتوو بە خۆت و بەو ئەقوستانیە بچیە بەرامبەر دێوان؟. گۆتی : هەر دەچم و ناگەرێمەوە با کەس لە گەرم نێ، لاچەقینگرە جۆرکەك جۆی لە گەر خۆی بردو، رۆیی. لە ناو شاری هەر جییێك و بەردەکە مارەکی پەلەوەری لێبوایە دەیگۆ تی. تی. تی. تی چەند مریشك و جوجکە و قازو مراوی

دەکەتنە دوو لاچەقنیگرەی هەر بە تی. تی. گاسی دەکردن دەگەیشتە هەر گوندەکی چەنگە جۆیەکی ڕوو دەکردو، دەیگۆ تی. تی. تی. چەند گوندی کرد ئەوهای دەکردو مریشك و کەرەبابی گوندی هەمووی لە دوی دەرۆیی، هەتا گەیشتە بەر دەرکەی ئەشکەفتیٚ بە خۆو بە لەشکری پەڕەوران چاوەڕێی دێوەیان دەکرد دێو بە گرمە گرم لە عاسمانیٚ هاتە خواریٚ، لە کن دەرکەی خۆی بە عاردی دادا. لاچەقنیگرە جۆی پێدا کرد، لەشکر خۆیان پێدادا کەتنە سەری بە دندوکان چاویان دەرینا، ئەوجا لاچەقنیگرە خەنجەرەکی لێدا و کوشتی. لە ئەشکەفتیٚ چووە ژۆریٚ دیتی کیژەك دانیشتییە دەرێی کارمامزە بە زنجیری بەسترایتەوە. گۆتی : ئەریٚ کەرتکۆکە ئەوە کو گەیشتیە ئێرە ؟ ئەویش گۆتی: پێم بریٚ ئەحمەدو محەمەدی برام لە کێنە ؟ ئەوجا ئەتوش رزگار دەکەم. کیژە گۆتی : ئەحمەدو مەحمەد بەو ئازایەی خۆیان هاتنە ئێرە دێوەیان پیٚ نەکوژرا، وەکی من زنجیر کراینە، وا لە ژێر زەمینیٚ کەتینە بەتووی یەك دەست قووتار دەبین؟. لاچەقنیگر گۆتی : مەترسیٚ کەلەشی دێوی وا لە دەرکەی ئەشکەفتیٚ کەتییە. چوو زنجیری دەستی کردەوە و چوون ئەحمەدو محەمەدیان دەرینا و دەستیان لە ملی یەککردو گۆتیان: ئەتوو کوو گەیشتییە ئێرە ؟ لۆی گێرانەوە کە بە خۆی و بەو لەشکرەی هاتین، دێویان کوشت هەتا ئەنگۆ قوتار بکەم. کیژەکە ناوی فاتم بوو گۆتی : وەرن با بچین بیرەکی گەورەی هەیە ئەو دێوە پڕی زێڕو گەوهەرە، دوو خوشکی منیشی لە ناو بەستاتیەوە، ئەگەر پێتان بکریٚ قوتاریان بکەن و، ئەو مارومرکەش لۆ خۆمان بیبەین، ئەنگۆش براو ئەمەش سیٚ خوشك. گۆتیان: زۆر زۆر باشە لە ئەشکەفتیٚ هاتنە دەریٚ رۆیشتن هەتا گەیشتنە سەر بیریٚ. دەی یەك خۆی شۆرکاتەوە بە گوریسی شمەکەکان هەر دەکێشن، ئەوجا ئەویش رادەکێشن. ئەحمەد گۆتی : ئەمن شۆربکەنەوە، گوریسیان لە ناوقەدی بەست و شۆریان کردەوە هەتا نیوەی هاواری کرد، ڕامکێشن، ترسا. ئەوانیش هەریان کێشا محەمەدیش چوو، ئەویش وەکی وی نەوێرا بچیتە خواریٚ. لاچەقنیگرە

گۆتی: لە منتان نەکەوی ئەمن دەچم، ئەویان شۆر کردەوە هەتا خواریّ چاوی بەو هەموو زێرو زەبەندەی کەت و، دوو کیژی جوانی وەکی گوریّ دەگەشێنەوە زێرەکانی هەموو بە گوریسیّ هەرکێشا و، ئەوجا هەردوو کیژەکان. گوتییە خوشکی گچکە، ئەتو لۆ خۆم بە. ئەویش گۆتی مادام ئەتوو لەو بیرەت قوتار کردین سەدجار لۆ تومە ئەو جارە جاریّ دوایێ بوو گوریسی لە ناو قەدی خۆی بەست، هەریان کێشا لە نیوەی رێیّ وەکی دیتیان چ نمایە، بە خۆیتی گوریسیان پساند. لاچەقینگر کەتە ناو بیریّ. ئەوەندەی کیژەکان گۆتیان لە ناوچەوانی وی قوتار بووین لۆ وەتان کرد؟ ئەحمەدو محەمەد گۆتیان : دەنگیّ بکەن سەرتان دەبرین . دەچینەوە دەرێین هەر ئاگامان لیّ نیە و نەشمان دیتییە، لە ناو بێری دەمری و نابێتە دەریّ. بەریّ کەتن لۆ شاری خۆیان، چوونەوە لە شاری بووە هەرا، خەبەر لۆ داکیان چوو ئەحمەدو محەمەد هاتنەوە، بە پیریان وە چوون و داك لە خۆشیان خەنی بوون و بووە شایی و دۆرو زورنا . داکی لاچەقنیگرەی چووە کن ئەحمەدو مەحمەدی دەستی لە ملی کردن و ماچی کردن، گۆتی: بە قوربانتان بم ئەدی کەرتکە براتان چی لێهات ؟ ئەوانیش گۆتیان هەر نەماندیتییە. داك دەستی بە گریانیّ کرد. هەموو دەمیّ بە دری بە خەم دادەنیشت، بەرگی رەشی لە بەر کرد، ئەحمەدو محەمەد ژنیان لە خۆ مارە کردو شاییان گێڕاو لە جێی پاشای دانیشتن. خوشکی گچکە ماوە. ئەو لە هەردوکان جوانتر بوو چەند کوڕە پاشا دەهاتنە داخوازی رازی نەدەبوو، سوندی خوارد مێردی نەکا ئەگەر لاچەقنگر نەبی، دەناکەزی سپی بهونیتەوە.... با بچینەوە رۆخی بیریّ، حەفت شەو لاچەقنیگرە لە ناو بیری ماوە، هەندە پەلکەنانی رەقی پێبوو رۆژیّ پەلکەکی دەخوارد، هەر ئەوەتە هەناسەی مابوو لە برسان. بەختی وی ڕیوییەك دەکەوتە ناو بیرەکەی، خۆی لە پشتی ریوی قایم دەکا بە دیواری هەردەگەڕی هەتا دەگاتە سەر رۆخی بیریّ، ئەوجا لاچەقنیگرە هاتە دەریّ خۆیو ریویەکەشی قوتار کرد. رۆیی گەیشتە گوندەکی لە مارەکی مێوان بوو. گۆتی: گەلەکم برسییە لە ڕێیەکی دوور هاتیمە،

مارەش نان و شیویان لەپێش داناو گۆتیان: ئەوشۆ لێرە بەو ماندی خۆت بحەسێنەوە، ئەویش مەمنوون بوو. رۆژ هەراتێ لاچەقنیگر بە رێکەت لۆ شاری خۆیان، گەیشتە شاری مندارەك بە غار چووە کن داکی لاچەقنیگرەی" گۆتی : مزگێنی کورەکەت هاتەوە. ئەویش باوری نەکرد" گۆتی : هەتیم وس بە بەبیرم مەینەوە، کورە بە ژۆری کەت، داك چاوی بە کورەی کەت لە خۆشیان دەمەك بێ هۆش بوو، وەکی بە خۆهاتەوە کورەی لە باوەشێ خۆی ناو، لێی پرسی : ئەرێ کور ئەتوو چت لێهات ؟ گۆتی دایە دانیشە با لۆت بگێرمەوە چم بە سەرهات. ئەوجا لاچەقنیگرە دەستی کرد بە گێرانەوەی سەربردەی خۆی. داکی گۆتی : چاوی داکت کۆرە بی، ئەدی لۆ برایەکانت هاتنەوە گۆتیان ئەمە هەر نەماندیتییە؟ ئەویش گۆتی: خۆنیشانەیان پێوەیە، مۆرم لە هەردوکان دایە لۆ رۆژەکی وەکی ئەورۆ. لە داکی پرسی : کیژەکان چیان لێهات ؟ ئەوان چ دەنگیان نەکرد؟ داکی گۆتی : کورم دوان لۆ ئەحمەدو محەمەدی، ئەوی گچکە چەند کەس دەوعای کرد مێردی پێ نەکردن، چونکە خۆی لۆ توو دانابوو. ئەوجا هەردوکیان چونە کن ئەحمەدو محەمەدی بەرامبەریان راوەستان، لاچەقنیگر گۆتییە برایەکانی لۆ وەتان لە من کرد؟ لە ناو بیرێتان بە جێ هێشتم، لە باتی چاکەم قوتارم کردن ئەنگۆم کردە ساحێب ژن و مارو زێرو پارە. ئەوجا خەرکی شاری هەمموو خرکردەوەو وەزیری گاسکرد گۆتی : لە پێش ئەو خەرکەی دەبی قوونی ئەحمەدو مەحمەدی رووت بکەی مۆری منیان پێوەیەبیبینن، هەتا بروا بکەن. ژنەکانیان گاس بکەن ئەمن راست دەکەم یان درۆ. وەکی خەرکی شاری زانیان ئەوهایە" گۆتیانەوێ لاچەقنیگرە ببیتە پاشامان ئەوجا لاچەقنیگرە بووە پاشاو، ژنیان لۆ گواستەوەو، شاییان لۆ گێراو، ئەحمەدو مەحمەدیش بە چاوی شۆر دانیشتن. لاچەقنیگرە گۆتی : ئەگەر حەقی کوشتننتان هەیە بەرام چونکە برامن دەستم ناچیتێ بتانکوژم لە راهی خوای لێتان خۆش دەبم .

ئەمنیش هاتمەوە چیان نەدامێ .

# تاجرو جوولەکە

تاجرەك هەبوو یەك كوڕی هەبوو، زۆر دەورەمەند بوو. بە كوڕەكەی گۆت : ئەگەر مردم ئەو مارو مركەی هەیتم هەمووی لۆ تووە، دەبی ئەتوش زۆر بە ڕێك وپێكی نیشی پێ بكەی و، نەی چوێنی خەرك پێت بڕێ كوڕی تاجری كوڕەكی خراپە. گۆتی : بابە بە سەرچاو. تاجر عەمری خوای كرد. كوڕەكەش ژنی هێناو مارەكی خۆشی داناو ...
ژنەكەی زۆر خۆش دەویست سێ ساران لە ماڕێ نەچوە دەرێ، جێی نەدەهێشت، ژنەكەش زۆر ئاقرو تێگەیشتی بوو. بە مێردەكەی گۆت : بڕۆ نیشەكی بكە ئەوها دامەنیشە لە دیارە من، ئەگەر ئیش نەكەی ئەو مارو مركە خلاس دەبی، ئەوها دەمینێتەوە. ئەویش بە قسەی كرد قافرەی حازر كردو باریان لە وراغان باركرد ڕەسمی ژنەكەی لە باغەری خۆی ناو بردی. بیست ڕۆژ بە ڕێوە بوون، شەوان خیوەتیان هەردەداو دەحەسانەوە نانیان دەخواردو دەستیان بە قسان دەكرد، هەتا ڕۆژ دەبۆوە. زەینی خۆیان دایی كوڕە تاجر ناوی ( حەمەد ) بوو ڕۆژ بە ڕۆژ لەڕو لاواز دەبوو، دەچو بە دزی ڕەسمی ژنەكەی ماچ دەكرد و لە باغەری خۆی دادەناوە. ئەو پیاوو خزمەت كارەی لە گەری بوو یەكیان جولەكەبوو. گۆتی : بابزانم ئەوە بە دزی دەچی چ دەكا ڕۆژ هەرات دیسان باریان بار كرد و ڕۆیشتن، شەو داهات. لە سەر ئاوەكی باریان خست و، خێمەیان هەرداو، ئەوجا جولەكە لە دوو حەمەی چوو، بزانی چ دەكا لە پەنایێ؟ تەماشای كرد، ڕەسمەكی دەرهیناو ماچی كرد، دەستی بە گریانێ كرد. ئەوجا جولەكە لە بن خێمەی گۆتیە : پیاوەكان دەزانن ئەو تاجرەمان ئەشقی ژنەكی خراپ بووە لە بەر وی لاواز بووە. ئەویش گۆتی : نا پیاو ئەوە ڕەسمی خێزانمە. گۆتی : دەبڕۆ ئەو ڕەسمە لە كن هەموو كەسەكیە،

حەمەد زۆر تورە بوو. جوەکە گۆتی : دەوەرە با گرۆی بکەین دەچم رەسمی ئەو ژنەت لۆ دەینم. گۆتی : ئەگەر گرۆت بردەوە هەموو مارو مرکی خۆمت دەدەمێ، وە ئەگەر دۆڕاندت دەت کوژم. جوەکە گۆتی : با فێرەکی ببینمەوە، قافرەی بەجێ هێشت هەستا ژنەکی مەکربازی پەیدا کرد. پێی گۆت: ئیشەکم لە بن دەستیە یاریم بکە ئەمنیش پارەکی باشت دەدەمی. ژنەکەش رازی بوو. پێکهات لە گەری جوەکە هەستا سندوقەکی داری دروست کردو، کامیرەکی پەیدا کرد بە ژنە مەکر بازەکەی گۆت : ئەمن بە کامیرەوە دەچمە ناو سندوقەکەی ئەمن لە ناو سندوقەکەی کلیل دەدەم، ئەتوش بمبە لە ماری تاجرم دابنێ، لە پاش دوو رۆژ وەرە بم هینەوە ژنە مەکر بازەکەش هەستا کراسەکی سپی لە بەر کرد، چەفیەکی کەسك و تەسبیحەکی لە مل کرد، خۆی کردە سەید رۆیی، هەتا گەیشتە پێش ماری تاجری. ژنی تاجری چاوی پێ کەت گۆتی: دایە سەید بە خێرهاتی فەرموو لە کێ هاتی، ئەویش گۆتی : زۆر ماندێمە ئەگەر جێتان هەیە ئەو شۆ ئەو سندوقە لە ماری نگۆ بی. ژنی تاجری گۆتی : بە سەرچاو. سندوقیان بردە ژۆرێ. شەوێ بە دزی جولکە لە ناو سندوقێ هاتە دەرێ، رەسمی ژنەی گرت و چۆوە ناو سندوقێ. سبەینی مەکرباز هاتەوە سندوقی بردەوە، گۆتی: زۆر مەمنون.. جولەکە رەسمی بردو رۆیی لۆ کن تاجری، رەسمی پیشانی تاجری داو، گۆتی: ئەوە گرۆیەکەم بردەوە. تاجر وەخت بوو شێت بی. گۆتی : فەرموو ئەتو وەرە جێی من ئەمنیش لە جێی تۆ ئیش دەکەم. رۆیشتن گەیشتنە شارەکی لەوێ دەستیان کرد بە تیجارەت کردن. بووە مانگەك تاجر نەگەڕاوە، ژنەکەی زۆر خەمبار بوو، هەر دەی گۆ خوایە ئەو پیاوە لۆ نەهاتەوە. خەبەر گەیشتە ژنەکەی تاجر کە ( جووەکە ) بە فرت و فێر هەموو ماری لە بن دەستی مێردەکەی دەرهینایە. ژنی تاجر تەگبیرەکی کرد لە شاری خۆیان قافرەکی تجارەتی رێك خست، بەرگی پیاوانی لە بەرکردو، خۆی کردە سەر قافرەچی رۆیی هەتا گەیشتە ئەو شارەی مێردەکەی لێبو ... دیاریەکی زۆر جوان و بە قیمەتی کڕی و لە

گەر خۆی برد لۆ پاشای ئەو شارەی ... دیاریەکەی نارد لۆ پاشای، گۆتی : سبەینی دەچمە خزمەت پاشای ناوم ئەحمەدە کوڕی مەحمود پاشایمە لۆ تجارەتی هاتیمە : پاشا چاوی بە دیاری کەت شتەکی زۆر جوان و بە قیمەت بوو، زۆر دری پێ خۆش بوو، پاشا زۆر بە گەرمی حورمەتی گرت و بەخێرهاتنی کرد. دانیشتن لە گەر یەك دەستیان بە قسەو گفت گۆکرد، پاشا زۆر دری بە قسەکانی خۆش بوو، خۆشی ویست. پاشا گۆتی : هەر ئەمرەکت هەیە ئەمن حازرم، ئەحمەد چووە بازاری کن مۆر هەر قەنەی مۆری دروست کرد بە ناوی ئەحمەد مەحمود پاشا، هاتەوە دیوەخانی پاشای، دوایی چووەکن جوولەکەی. پێی گۆت : ئەو شۆ دەعوەتی منی دەبی لە گەر یەك دابنشین هەندەك باسی تجارەت بکەین، شەوێ جوولەکە هات ئەحمەد ئارەقی دایێ و سەرخۆشی کرد، چ ئاگای لە خۆ نما بوو. ئەوجا مۆرەکی بە قونی جووی وەنا. دوایێش سەرۆ مۆری لە هێسترەکان دا، ئەوانی کە ئی خۆیان بوو جوو بردبوی بە فێری گرۆی خۆی مات کردو چووە کن پاشای. پێی گۆت : عەبدەکمان هەیە بە تەمایە نیوەی مارەکەمان زەفت بکا، پاشا لە دوی نارد بە جووی گۆت : عەیب ناکەی ماری ئەو کوڕە پاشایەی زەفت دەکەی؟ گۆتی: ئەوە ماری خۆمە ئی کەس نیە! ئەحمەد گۆتی: ئەمن وەلیم هەیە، کە ئەو عەبدی منە، دوو پیاویان گاس کرد، تەماشایان کرد هەموو مۆری یان لێدرایە... ئاشکرابوو کە عەبدی وانە... جووەیان گرت، تێر شەقیان کرد شاپەکیان لێدا. جوولەکە، دەست و پێی ئەحمەد پاشای ماچکرد و گۆتی: هەر عەبدی جارانم قبوورم بکەن ئیشتان لۆ دەکەم، ئەوجا قافرەیان بارکردو بەڕێکەتن. ڕۆیشتن لەسەر ئاوەکیان خست و خێمەیان هەردا... نانیان خوارد و نوێژیان کرد... دانیشتن و دەستیان بەقسان کرد.

ئەحمەد پاشا گۆتی: کێ حیکایەتی دەزانی؟ بڕێ....

ئەحمەد، ژنی تاجریە. ئەو مێردەکەی خۆی دەناسی، مێردەکە ئەوی ناناسی... توجارِ دەرێ: وەڵڵا ژنەکی بێ ئەخلاقم هەبوو، جوولەکە لەبەر ئەوحارەی مارەکەی لەمن

ستاندو کردیه تی خۆی.. ئەوجا گاسی جوولەکەی کرد پێی گۆت: وەرە بزانم ئەتو گرۆت کرد؟ جوولەکە گۆتی: هەرلێم گەڕێ" گۆتی: لێت ناگەڕێم هەردەبی قسم لۆ بکەی...
جووەکە گۆتی: بەخوای ئەمن بوختانەکی گەلەك گەورەم کرد، لۆیە وام بەسەر هات...
بەسەرهاتەکەی هەموو گێڕاوە... ژنەش هەمووی دەزانی هەتا گەیشتەوە شاری خۆیان.
ژنەکە گۆتی: ئەوە شاری ئەحمەد پاشایە...
مێردەکەی گۆتی: شاری ئەحمەد پاشای چ.. ئەوە شاری خۆمانە. هاتنەوە مارێ خۆیان و وراغەکانیان لە تەویلەی کرد بحەسێنەوە هەر کەسە چۆوە ماری خۆیان.
ژنە بەرگی خۆی گۆڕی و گۆتیە مێردەکەی: ئەمن ژنەکی خراپ و بێ ئەخلاق بووم هەی ناپیاو! بەقسەی جوولەکەی ئەوهات کرد.. من نەبام جوولەکە هەموو مارو مرکی لۆ خۆی دەبرد.. ئەتوش دەستت بەردەبوو.. ئەوجا تاجر دەستی ماچ کردو گۆتی: ئەتو نەکەی ئەمن کردم.. لەگەریەك چاك بوونەوە، بەشادی و خۆشی ژیانیان بردەسەر....

# گورو سنۆبەر

پاشایەك هەبوو.. تاقە كوڕەكی هەبوو. زۆری خۆش دەویست.. كوڕە گەورەبوو.. تۆغیانی ژن هێنانی بوو، پاشا بە كوڕەی گۆت: دەمەوێ ژنی بینی پێم خۆشە مندارت ببینم، كوڕە گوتی: كیژی فرانە پاشام دەوێ. كیژی ئەو پاشایەش شەرتەكی هەبوو.. هەركەس دەچووە داخوازی پێی دەگۆت، حكایەتی گورو سنۆبەرم لۆ بگێڕەوە یان لەكن هەر كەسەكی هەیەو گێت لێ دەبی ، دەبی لۆم بینی ئەوە گرۆی منە. ئەگەر جێ بەجێ دەكەی مێردت پێ دەكەم. چەند كەسەك دەچوون لە شاران دەگەڕان، كەس نەی توانی ئەو حیكایەتەی ببینتەوە، دەچوون و نەدەهاتنەوە، كوڕی پاشای ناوی قارەمان بوو.... قارەمان سواری ئەسپی بوو، رۆیشت هەتا گەیشتە ئەو شارەی كە گورو سنۆبەری لێ بوو. خەركی ئەو شارەی كە مێوانەك بچوبایە ئەو شارەی دەیانزانی لۆ گورو سنۆبەری هاتیە. خەبەریان لۆ پاشای نارد كە مێوانەك هاتیە لۆ حكایەتی گورو سنۆبەری. پاشا میوانی بەخێر هێناو بردیە دیوەخانێ و نانیان لۆ دانا ئەوجا پاشا لێ پرسی؟ لەكێ هاتی و لۆ چ هاتی؟ قارەمان گۆتی: لۆ حیكایەتی گورو سنۆبەری هاتیمە. پاشا گۆتی: ئەمن ئەو حیكایەتەی لۆ هەركەسەكی بگێڕمەوە، دەبی لەسەری بدەم. ئەتوش خینی خۆت لەملە خۆت، ئەگەر خۆت بەكوشتن دەدەی ئەوە لۆت دەرێم، دەنا بەچ رێگەی داهاتی بەوێ دا بگەرێوە. قارەمان گۆتی: بكوژی هەر دەبی لۆم برێی. پاشا وەزیرو مەلاو قازی گاس كرد هەمووی كردە شایەد، شەو داهات قارەمانی لەگەر خۆی بردە مارێ و لە هۆدەكی دانیشتن، دیتی تەیرەك لەناو قەفەزی بەدارێ وەكرایە، دوبارە پاشا گۆتی: قارەمان خینی خۆت لەملە خۆت، گۆتی: با لەملەخۆم بی.. پاشا گۆتی: ئەو تەیرەی

دەبینی، ئەوە گورێی خێزانمە، ئامۆزای خۆم بوو زۆر یەکدیمان خۆشدەویست هەردوکمان خۆمان تۆق دەکرد هەتا لە یەکدی جودا نەبینە.

شەوەك لە خەویٚ بەخەبەر هاتم، دەستم لۆ برد هەموو بەدەنی ساردبوو، تومەزە بەدزی چویوە دەرێ، ئەمنیش هەستم پێ کرد کە ئەوە دەبی شتەك هەبی لەگۆڕێ، دەنگم نەکرد، شەوی پاشتری تۆقمان لەخۆمان بەست و نووستین، بەرام ئەمن خۆم بوارد، خەوم لێ نەکەت، گورێش وای زانی نوستیمە لەسەرەخۆ تۆقەکەی کردەوە چووە دەرێ، ئەمنیش لەدوی چووم دیتم خزمەتکارەك ئەسپی لۆ راگرتیەو سوار بوو رۆیی. هاتمەوە سەرجێی بەرەبەری بەیانیان هاتەوە ناو تۆقەکەی.

خزمەتکارەکەش وای دەزانی ئەوە پاشایە شەویٚ دەچێتە دەرێ چونکە گوری جلکی پاشای لەبەرکرد. پاشا خزمەتکارەکەی گاس دەکا پێی دەرێ ئەوشەو دوو ئەسپ حازر بکە یەك سەعات دوو، یەك سەعات دوو و نیو.. دەرێ ئەمر دەکەی گەورەم.

دیسان شەو داهات، گور خۆی گۆڕی و چووە دەرێ، پاشاش لەدووی رۆیشت، بەدزی لەدوی چوو. رۆیشت هەتا گەیشتە چیایەکی زۆر دوور نەبوو لەشاری خۆیان، گور چووە ناو چیای ئەمنیش لەدوی چووم، ئەوجا گور لە ئەسپی دابەزی، ئەسپەکەی بەستاوە، ئەشکەفتەك لەقەد چیایەکەی هەبوو،چووە ناو ئەشکەفتێ، لەدوی چوم و خۆم لە پەنای مات کرد. حەفت دێو لەناو ئەشکەفتی دانیشتبوون، چەند قسەی ناشیرین هەبوو بەگور یان گۆت، پێیان گۆت لۆ وەها درەنگ هاتی، کە ئەو حارەم دیت، پێش ئەو بگەرێتەوە سواری ئەسپەکەم بووم و گەرامەوە ناو جێگا، دیسان گور پێش بەیانیان هاتەوە ناو تۆقێ. شەوێ لەخەو هەستام بە خزمەتکارەکارم گۆت: زوتر ئەسپەکەم لۆ حازر بکە، سواربووم رۆیشتم هەتا گەیشتمە ئەشکەفتێ، حەفت دێوەکە خەویان لێ کەتبوو.

شیری هەرکێشا هەر حەفتی کوشتن، گێ و کەپوی هەر حەفتانی بڕی و لەناو تورەگەکی کرد و لە پشتی ئەسپەکەی قایم کرد و هاتەوە ناو تۆقەی خۆی بەرام خەوی لێ نەکەت.

گوریَ دیسان نیوەی شەو رۆیشت لۆ ناو ئەشکەفتیَ، تەماشای کرد دێوەکان کوژراینەو کەپو و گێیان بڕایە، بە درەکی بەخەم گەڕاوە ناو جێی خۆی و دەنگی نەکرد، نەی زانی پاشا سنۆبەر ئەو ئیشەی کردییە. کە ڕۆژ هەرات و بووە چێشتان گور لە خەویَ هەستاو جلکی ڕەشی لەبەرکرد. ئەوجا تورەگە کەپوو گێیەکەم لەپێش داناو گۆتم ئەوە مێردەکانت، گور شورە دارەکی لە پاشای دا گۆتی: ببیە سەیەکی ڕەش، پاشا بووە سەیەکی ڕەش دەچووە بەردەرکەو بن دیواری، چونکە هەرچەند سەگ بوو بەرام ئەقری بنیادەمی هەبوو، زمانیش نەبوو قسەی بکا، بەرەبەری بەیانی بوو چووە بەردەرگەی مارەکی، کیژەکی جوانیان هەبوو، کە چاوی بەو سەیەی کەت گۆتی: ئەوە پاشایە بویتە سەگ بەدەستی گوری، کە گێی لیَ بوو کیژەکە ئەو قسەی کرد، لەدوی ڕۆی یەقەی بەرنەدا، بابی کیژەی لە کیژەی پرسی؟ ئەو سەیە چییە لەدوت دێتە ژوریَ، کیژە گۆتی: بابە ئەوە پاشا سنوبەرە گور کردیتیە ئەو سەیە، بابی پێی گۆت، کیژم ئەگەر شتەکت پیَ دەکریَ بیکەیەوە بنیادەم وەکو جاران، کیژە گۆتی: بەشەرتەکی چاکی دەکەمەوە کە بمخوازی سەگە رەش لەخۆشیان کلکی بادەدا، ئەوجا کیژە بەقسەی بابی شورە دارەکی لە سەگە رەش داو چاك بۆوە، بۆوە پاشای جاران هەر ئەو وەختی ناردی مەلا هات کیژەی لەخۆی مارەکرد.

کیژەکە شورە دارەکەی دا دەست پاشاو پێی گۆت بڕۆ خۆت بگەینە گوری بەو دارەی لێی بدە، تۆرەی خۆت بکەوە ئاگات لەخۆت بی گور نەزانی ئەگەر بزانی لێت دەداو چاك نابیوە چونکە دەزانم ئەو سحرەمان پێکەوە خیندییە پاشا شورە داری بردو خۆی گەیاندە گوری شورەکی لێدا بە نیەتی ئەوەی کە ببتە هێستر گور بووە هێستر، گاسی خزمەتکارانی کرد گۆتی ئەو هێسترەی ببەن هەر بەردی پیَ بکێشن، هەموو ڕۆژیَ بەردیان پیَ دەکێشا، ئێواران دەیان بردە تەویلەی ئەوجا پاشا دەچو تەماشای دەکرد دەبینی وا دەگرییَ شورە دارەکی دی لێدا کردیە تەیرەك لەناو قەفەزی کردو لە بەرامبەر

جێی خۆی دانا. ئەوجا پاشا سنۆبەر گۆتییە کوڕەی بینە لە سەرت بدەم حیکایەتەکە تەواو بوو. ئەوە حیکایەتی گورو سنۆبەری. کوڕەش گۆتی با دوو رکات نوێژان بکەم ئەوجا لەسەرم بدە، بەفێری نوێژی چووە سەربانی، خۆی شۆرکردەوەو هەرات و خۆی قوتارکرد، پاشا سنۆبەر وەزیری گاس کرد کە لە سەری کوڕەی بدەن، هەر دانیشتن کورە هەر نەهاتەوە. گۆتی بڕۆن بیهینن ئەو نوێژە بووە چ چون تەماشایان کرد حەوش و بان گەڕان چ دیار نەبوو پاشا بەخۆی چووە سەربانی بزانی خۆی قوتار کردییە، هاتە خوارێ قەفەزی تەیری بە عاردی داداو کوشتی ئەوجا شیرەکی لە خۆشی داو خۆی کوشت. کوڕە چووە کن کیژی پاشای و حیکایەتی لۆ گێراوە، ئەوجا کیژە گۆتی: ئەتو لە هەموو کەسەکی نازاتر بووی مێردت پێ دەکەم هەر ئەلعان برۆ مەلای بینەو مارەم بکەو شایی و بەزمی دەست پێ بکە.. مرازی کوڕەی حاسر بوو..

# ئەمین بەگ و لاوی نەناسراو

هەبوو نەبوو، پاشایەك هەبوو، تاقە کورەکی هەبوو ناوی (ئەمین بەگ بوو). ئەو پاشایە کوڕەکەی زۆر خۆش دەویست دری نەدەهات بینێریتە دەرێ نەوەك چاوو نەفەس لێی بدا. هۆدەکی لە کۆشکی لۆ دروست کردبوو، هەموو چشتەکی لۆ دانابوو، دەرکەی لەسەر پێوە دەدا، مەلایەکی لۆ گرتبوو تا فێری ئیشوکاری بکاو قورئان و خوێندنی فێربکا، نان و شیویان لۆ دەبردە سەرێ. ئەو کوڕە تیشکی ڕۆژی نەدیتبو، جامی پەنجەرەکەی برندو ڕەنگ ڕەنگ بوو، هەموو ڕۆژێ خواردنی خۆشی لەپێش دادەنرا. برنج و گۆشت و مەرەگەی لۆ هات لەپێشیان دانا دەستی کرد بەنان خواردن، گۆشتی ناو مەرەگەی بەهێسك بوو. ئەویش هەر نەرمە گۆشتی دەخوارد زۆر توڕە بوو، هێسکەکەی برند کرد فڕێی دا بە پەنجەرەی کەت، جامەکە شکا، تیشکی ڕۆژ هاتە ژۆرێ، بەسەرسوڕمانەوە هەستا دەستی لۆ تیشکەکە درێژکرد بیگری، پێی نەگیرا.

دەرێ خوایە ئەوە چییە ئەمن دەبینم، سەری لە پەنجەرەی بردە دەرێ تەماشای خوارێی کرد خۆی شۆڕکردەوە لە پڕەکی کەتە خوارێ و دەکەوتە ناو تەویلەی وراغان. دەمەك لەوێ دەکەوی. ئەوجا تەکانەکی دەداتە خۆی هەردەستیتەوە لەناو تەویلەکەی دەگەڕێ، چەند ئەسپ و ماینی جوان وا دەلەوەڕێن، هەریەکە ئاخوڕەکی لۆ دروست کرایەو کاوو جۆی تێکرایە. لە دری خۆی دەرێ لۆ بابم ئەمنی لەو کۆشکەی حەپس کردییە نەی هێشتیە چشتەکی ببینم لەپشت ئاخورەکی رسمەکی دەبینی هەرپەساردرایە، وەکی تەماشای دەکا ڕەسمی کیژەکی زۆر جوانە، ڕەسمەکەی لەسەر کۆشی خۆی دادەنێ هەر تەماشای دەکا لەهۆش خۆی دەچی.

مەلاوەکی ڕۆژان بەسەر دەکەوی، کوڕە لە ژوریٚ نمایە، پەنجەرە شکایە. بەخێرایی دەچیتە خواریٚ دەبینی وا لەناو تەویلەی لەخۆچووە. هەندەك ئاوی پێدا دەکا هەتا بەهۆش دێتەوە. لێی دەپرسی؟ کوڕم لۆ هاتیە ئێرە، ئەویش سەربردەکەی لۆ دەگێڕیتەوە. دەریٚ مامۆستا لۆ لەگەر بابم هەتا هەنوکە ئەمنتان حەپس کردبوو نەتان هێشتیە دنیای ببینم. هەنوکەش دەبی پێم بڕێی ئەو ڕسمە کێیە؟ و لۆ لێرە داندرایە، ساحێبی ئەو ڕسمەم هەر دەویٚ. مەلاش دەریٚ هەستە بابتهینمە دەریٚ هەندەك دنیای ببینەو بچینە ڕاویٚ شتی فێربە، دەریٚ بەشکو ئەو ڕسمەی لەبیر دەکا، بەرام پاش ئەو گەڕان و سوڕانە، بەمەلای دەریٚ بڕۆ بە بابم بریٚ ژنم دەویٚ و ئەو کیژەم دەویٚ. مەلاش دەچی ئەو قسانە هەمووی لۆ پاشای دەگێڕیتەوە، پاشا لەلایەك پێی خۆشە کوڕی دەوعای ژنی دەکا، لەلایەکیش پێی ناخۆشە ئەو ڕەسمەی دیتییەو دەوعا دەکا، دەریٚ مەلا بڕۆ پێی بریٚ چەند کیژی جاحێری شارو گوندی لۆ خڕدەکەمەوە شایی و هەراو بەزمی بگێڕن با لۆخۆی هەربژێری، دەست لەسەر کیٚ دادەنیٚ لۆی دەینم، بەس ناوی ئەو ڕەسمەی نەینی. کوڕەش ڕازی نابی، دەریٚ هەر ئەوەم دەویٚ پاشا دەریٚ، کوڕم چەند لە دوو ئەو ڕەسمەی گەڕایمە نەم دیتیتەوە بەدەستم نەکتییە ئەتوش خۆت ماندی مەکە.

دەریٚ بابە دڕۆم بە وراتان دا دەگەڕێم سەری خۆم هەردەگرم هەتا دیبینمەوە پاشا وەکی دەزانی کوڕەکەی هەر دەڕوا بەقسەی ناکا. چەند خواردن و خزمەتکاری بەگەر دەداتن و خواردنی مانگەکیان لۆ باردەکا، بەریٚ دەکەون چەند شەوو چەند ڕۆژ بەرێوە دەبن. زۆر هیلاك دەبن، خزمەتکارەکان بێزار دەبن بە کوڕی پاشای دەرێن، پێت ناخۆش نەبی درگران مەبە ئەمە دەگەڕێینەوە مارو مندارمان بەجیٚ هێشتیە، (ئەمین بەگ) دەریٚ فەرموون بگەڕێنەوە، قەت پێم ناخۆش نییەو لە هاتنی خۆم پەشیمان نیمە. خواحافیزی لە یەکدی دەکن و دەڕۆن، ئەویش تاقە سوارە بەریٚ دەکەوی و دەروا، حەفت شەو ورۆژ هەر دەڕوا. ئەسپەکە زۆر ماندی دەبی لەناو ماندی بونی خۆی بەزمان دیٚ واتا زمانی

دەکرێتەوە قسەی لەگەر دەکا، دەرێ زۆر ماندی بووم پێیەکانم بریندار بوون هەندی برۆم، ئەوجا (ئەمین بەگ) لەسواری ئەسپەکە دێتە خوارێ و هەندەك گیای دەکوتی لە پێی ئەسپەکەی دەداو لۆی دەپێچی.

ئەو شەوە لە چۆلیان دەنوی هەتا ئەسپەکە بحەسێتەوە.

رۆژ دەبێتەوە هەندە نانە رەق دەخواو ئالیکی دەداتە ئەسپەکەی، ئەوجا سوار دەبی، وەکی ئاورِ دەداتەوە پشتە خۆی بیرەکی ئاوی لێ بەدیاردەکەوی دەرێ دەبا بچم ئەسپەکەم ئاو بدەم، خوا ئەگەر لۆت بینی بەخۆشت نازانی کو لۆت دێ.. (ئەمین بەگ) تەماشا دەکا وا چەند پیاوەك کۆمەرە حوشترەکیان بەپێش خۆیان دایە هەموویان باری گرانیان لێ بارکرایەو لۆ توجارەتی دەچن. هەست رادەگری لە پیاوەکان یەکیان دەرێ ئەوە ساحێبی بیرەکەیە هاتییە حەقی ئاومان لێ وەربگری حەفت سارە حەقمان نەدایە، با حوشترەکی بە مارەوە بدەینێ. دەچنە پێش سەلامی دەکەن دەرێن ئەوە حوشترەکمان لۆ هینای حەقی ئاوی.

ئەویش دەرێ ئەمن حەفت سارە چم وەرنەگرتی یە حەفت حوشترم دەوێ، حەفت حوشتری بە مارەوە دەدەنێ و دەرۆن. ئەوجا (ئەمین بەگ) حوشترەکان بەپیش خۆی دەداو دەروا. هەتا دەگاتە شارەکی دەبینی وا دەورەی ئەو شارەی بە خیوەتان گیرایە دەرزی باوێ بە عەردی ناکەوی. توشی گاوانەکی دەبی لێی دەپرسی ئەرێ کاکە لەو شارەی چ روی دایە؟

گاوان گوتی: ئەوە حەفت رۆژە گاور هاتینە ئەو شارەیان گرتییە دەرێن، یان شارەکەی تەخت دەکەین یان کیژی پاشای دەبەین. پاشا کیژەکی زۆر جوانی هەیە ناداتە گاوران.

(ئەمین بەگ) دەرێ ، وەرە لەگەر من بە چیدی گاوانی مەکە پارەکی باشت دەدەمێ..

گاوانیش خەنی دەبی لەخۆشیان لەگەری دەچی، ئەوجا خیوەتەکی هەردەدا لە خیوەتی وان دورتربی و رەنگی جوایەز بی هەتا دیاربی. ئەوجا بە گاوانی دەرێ ئەتوو ئاگات لە حوشترەکان بی و لەبن خیوەتی بە ئەمن بەیانیان بەناو گاوران دەکەوم و قرِیان دەکەم،

شێرو زرێ لەخۆی قایم کرد و ناوی خوای لێ هیناو رۆی لە خیوەتان کرد. بەناو گاوران کەت، هەموو لە خەوێ دابوون یەك یەك هەردێن قوتار دەبن، ئەوی دیش هەمووی دەکوژی و خیوەتان تێك دەدا. خەبەر لۆ پاشای دەچی گاور کوژراینەو خیوەتیان نمایە. پاشا دەرێ کێ ئەو ئیشەی کردییە بمخوازی ماری دنیایێ، هەرکەسە لەجێی خۆی دەرێ ئەمن بووم. پاشا بڕوا ناکا، بە وەزیری دەرێ با بچین بگەرێین بە دووربین تەماشا بکەین بزانن چ هەیە.

لەسەر گردەکی رادەوەستن تەماشا دەکەن بە دووربین دەبینن یەك خیوەت مایە، بەسەر سورمان تەماشای یەك دەکەن.

وەزیر دەرێ بابچین خۆ سەرمان نابڕی بزانین چییە؟

پاشاو وەزیر چوون گەیشتنە نیوەی رێ (ئەمین بەگ) بەپیریان وەهات. بەپاشای دەرێ ئەمن ئەو ئیشەم کردییە پاشا ڕوو لە وەزیری دەکا دەرێ چاکەی بە چ پڕبکەینەوە.

وەزیر گۆتی ، کیژەکەت قابیل بەو کوڕەیە و پێش کەشی بکە. ئەویش بەقسەی وەزیری دەکا، کیژەی لە کورەی مارە دەکەن شایی و بەزمەکی خۆشیان لۆ دەکەن، حەفت ڕۆژان هەر هەراو خۆشی دەبی.

ئەوجا (ئەمین بەگ) دەرێ ئەمن لە دوری شاری قەسرەکم دەوێ حەزم لەناو شاری نییە، پاشاش قەسرەکی خۆشی لۆ دروست دەکاو چەند خزمەتکاری پێش کەش دەکا، ئەوجا گاور کە هەموویان کوژران کەس و کاریان دەیانەوێ تۆڕەی خۆیان بکەنەوە، پلکەکی پیریان دەبی، چەرخو فەلەکی لۆ دروست دەکەن، پیرێژن سواری چەرخ و فەلەکی بوو رۆیی هەتا گەیشتە قەسری (ئەمین کوری، پاشای ئەوجا پیرێژن چەرخ و فەلەکی لە کەندەرانەکی دەشارتەوە دەچێت بەر دەرکەی مارێ (ئەمین بەگی) خزمەتکار لێی دەپرسن؟ پلکێ لە کێ هاتی، دەرێ ئەمن لە حاجیان دابرایمە بزر بویمە، هاتیمە ئێرە

خێرەکم پێ بکەن. ئەوانیش دەچن بە ژنی پاشای دەرێن کەناوی (گولخاترە)، دەرێ بڕۆن دەری بکەن درۆی دەکا .

دەری دەکەن پیرێژن لەبن دیواری دادەنیشی هەتا (ئەمین بەگ) پاشا دێتەوە شەوێ پاشا لە دیوەخانی خەزوری دەگەرێتەوە گێی لە نارەنارەکی دەبی دەچیتە پێش دەبینی پیرێژنەك وا دەگریێ، لێی دەپرسی؟ ئەتو چی و خەرکی کێندەری. دەرێ فەقیرم بزربویمە هاتیمە خێرەکم پێ بکەن لە دەرکەی مارینگۆ دەریان کردم. (ئەمین بەگ) دەچیتەوە ژورێ لە ژنەکەی خۆی دەدا لەسەر پیرێژنی دەرێ ئەو پیرێژنە مادام بێ کەسە، فەقیرە، حاجییە با لێرە بی ئاگای لە مارێ دەبی، کلیلی مارێی دەداتە دەستی دەرێ ئەتوو دەبی ئاگات لە مارێ بی، پیرێژن خەنی دەبی لەخۆشیان گولخاتریش زۆر تورە دەبی بەرام چ قسان ناکا، شەو دادێ پیرێژن تەماشای هەموو جێ و دەرگەی دەکا، لۆ سبەینێ دەرێ دەچم لەسەر گۆمێ کۆرێ دەکەم، حەزم لە ئاوی گۆمێیە دەچی سواری چەرخ و فەلەکی دەبی خەبەر لۆ گاوران دەنێری دەرێ ئەمن شەوێ دەرکان هەموو دەکەمەوە چرایان هەردەکەم ئەنگۆش وەرن خۆ تێ روو بکەن. پیرێژن سەرئاسنی جادوکەر دەگەرێتەوە. (ئەمین بەگ) وەکی هەموو نێواران دەچیتە دیوەخانی پاشای خەزوری، لەشکری گاوران هاتن بەناو کەتن مارەکەیان تاران کردو خزمەتکاریان کوشتن و گولخاتریان بەدیل گرت و بردیان گولخاتر قیچە خیندەواریەکی دەزانی، پێش ئەوەی برۆن بەدزی کاغەزەکی دەنوسی و بە جێ دێلی.. وەکی (ئەمین بەگ) دەگەرێتەوە دەبینی نە مار مایەو نە ژن نە خزمەتکار. کاغەزەکەی دەبینی لێی نوسرایە (ئەمین بەگ) مستە حەقت بێ ئەوها باشە بەقسەت نەکردم هەتا پیرێژن ئەوهای لێ کردین وا ئەمنت دا دەستی گاوران.. خەبەریان لۆ پاشای نارد با بەخۆ بە وەزیرەوە بێن. پاشا دەرێ: برۆن لەشکری ببەن مارو سامان لەکنە من چ نییە. برۆن گولخاتری قوتار بکەن. (ئەمین بەگ) دەرێ گەورەم بەخۆم دەچم

یان سەری خۆم وا دادەنێم یان لەگەر گوڵخاتری دێمەوە، کەس بـا ئەزیـەتی نـەخوا، تاقـە سوارە بێ لە رکێبی دەنێ و دەڕوا. دوو شەو رۆژ بەبێ ڕاوەستان.

لەپشت ڕا گێی لە دەنگی پێی وراغەکی دەبی هەروەستەی دەکاو ئاوڕ دەداتـەوە. دیـتی وا سوارەك بەغار لەدوی دێ.

رادەوەسـتی هـەتا سـوارەکە دەگاتـە کـنی. سـەلامی لـێ دەکـا ئـەویش سـەلامەکەی وەردەگرتەوە لێی دەپرسی ئەتو کێی؟ ئەویش گۆتی: مەپرسە ئەمن کێم؟ ئـەمن لاوەکـی نەناسراوم ناوبانگی تۆم بیست کە بەتەنێ دەچییە شەڕی گاوران لەگەرت دێم یارمـەتیت دەدەم، بەرام یەك قسەم هەیە وا دەرۆین هەتا ئەسپەکانمان لە کێ سەری خۆیـان شـۆڕکرد دەبی لەوێ دابەزین. (ئەمین بەگ) رازی بوو وەکی برایان رۆیشتن گەیشتنە پێش دەرکەی خانیەکی گچکە هەندەك دوربوو لە شاری. لەوێ ئەسپەکان سەری خۆیان شۆڕکردەوە.

ئەوجا لەوێ هاتنە خوارێ لە دەرکەیان دا، ئەو خانیە گچکە ئی پیرەژنەکی ئیسـلام بـوو یەك کیژی هەبوو، بەدزی کافران قورئانیان دەخیند سوارەکان لە دەرکەیان دا. بـەترس و لەرزەوە دەرکەیان کردەوە. سەلامیان کردوو لە پیرێژنیان پرسـی؟ ئـەو شـارە ئـی کێیـەو دەنگ و باس چییە؟ پیرێـژن گـۆتی. ئـەوە شـاری گاورانـە، وا هـەراو هۆریایـە، چـونکە ئیسلامەکانیان کوشتیە زۆر درخۆش دەبن بە کوشتنی ئیسلامان. (ئەمین بەگ) تێـدەگا کە ئەوان ئیسلامن دەرێ، پلکێ ئەمەش ئیسلامین، ئەوجا دەرێ فەرمون وەرنە ژورێ با کەس نەتان بینی، ئەوەی کوژرایە برای منە وا لۆ وی قورئـانی دەخیـنم. (ئـەمین بـەگ) دەرێ برۆ ناو شار بزانە چ هەیە. پلکە بەسێ دەچیتە ناو شـاری هەسـت رادەگـری. گێـی لێ دەبی کە پاشای گـاوران کیـژە ئیسـلامەکی فراندییـە ئەوەنـدەی دەکـا خـۆی ناداتـە دەست پاشای. دەرکەی لەسەر خۆی قایم کردییە لە کەس ناکاتەوە هـەتا نـانیش نـاخوا. پاشاش ئەمری کردییە ئەگەر هەرکەسەك ئەو کیژەی پـێ رازی بکـرێ مێـرد بـە پاشـای بکا، ئەو کەسە خەراتەکی گەورە وەردەگری.

هەرچەند کەس چوینە دەرکەی لە کەس نەکردیتەوە. پلکە بەسیٚ دەچیتەوە ئەو قسانە هەمووی دەگێریتەوە ئەوجا (ئەمین بەگ) شك دەکا کە ئەو کیژە گوڵخاترە. دەریٚ پلکە بەسیٚ برۆ بەهەر فرتوفێرەکی بی خۆت بگەیەنە کن ئەو کیژەی ئەگەر دەرکەی نەکردەوە پێی بریٚ لە پەنجەرەی خۆم پیٚ نیشان بدە ئەتوش ئەو ئەنگوستیلەی منی پیٚ نیشان بدە دەناسیتەوە پلکە بەسیٚ دەچی لە دەرکەی دەدا، دەرکەی ناکاتەوە. دەریٚ کیژیٚ بەس لە پەنجەرەی تەماشایەکم بکە یەك قسەت پیٚ دەرێم. ئەویش پەنجەرەی دەکاتەوە ئەنگوستیلەکەی پیٚ نیشان دەدا دەریٚ ئەو ئەنگوستیلەی دەناسی، ئەویش یەکسەر دەناسیتەوە دەریٚ ئەی بەقوربانت بم پلکیٚ ئەوەت لەکیٚ هینایە، دەریٚ ساحێبی وا لەماریٚ مەیە لەگەر نەفەرەکی. دەبا تەگبیرەکی بکەین، گولخاتر دەریٚ برۆکن پاشای بریٚ دو کیژم هەیە سیحری دەزانن وە دەکەم بە سیحر کیژەی رازی بکەن مێردت پیٚ بکا. پلکە بەسیٚ دەچیتە کن پاشای پێی دەریٚ ئەویش لەخۆشیان خەنی دەبی دەریٚ ئەگەر ئەتو ئەو چاکەی بکەی بخوازە ماری دنیاییٚ. پلکە بەسیٚ بەدری خۆش دەچیتەوە ماریٚ قسەکان دەگێڕیتەوە ئەوجا هەردوکیان خۆیان دەگۆڕنو نیقابی دادەپۆشن دەچنە کن گولخاتری. پلکە بەسیٚ پێیان دەریٚ وەکی لە دەرکەتان دا برێن سێومان پێیە هەتا بزانی ئەنگۆنە لە دەرکەی دەدەن گولخاتر دەرکەی ناکاتەوە ئەوانیش دەرێن دەرکەی بکەوە سێومان لۆ هینای. ئەوجا دەرکەی دەکاتەوەو بەیەکتر شاد دەبنەوە ئەوجا دەرێن با تەگبیری رۆیشتن بکەین، (ئەمین بەگ) دەریٚ وا دەچم بەناو دەکەوم، لاوەکە دەریٚ بەتەنیٚ مەچوو بابیتە نیوەی شەو بەجۆتە دەچین هەردوکیان بەناو گاوران دەکەون هەموویان دەکوژن.

دەرکەوان و پاسەوان دەکوژرێن، گولخاتری دەبەن دەرۆنە ماریٚ پیرێژنی لەگەڵ کیژەکەی ئەوانیش لەگەل خۆیان دەبەن قوتاریان دەکەن ئەوجا وەکی دەگەنە ئەو جێیەی کە لاوەکە بەگەری کەتبو. لەویٚ رادەوەستی لاوەکە دەریٚ ئەمین بەگ چ ئیشت بە من نمایە ئەتوش

بە سەلامەتی بگەڕێیەوە ئەمنیش دەگەڕێمەوە جێی خۆم. ئەمین بەگ زۆری تکا لێ دەکاو دەڵێ ئەمە تازە بوینە برا نابی لێك جودا ببینەوە. ئەویش دەڵێ ئیشی خۆم جێ بەجێ کرد بڕۆ خوات لەگەربی ئەوجا هەر کەس وبەڕێی خۆیدا دەڕوا، کە ئەمین بەگ دەگاتەوە شاری پاشای خەزوری مزگێنی لۆ پاشای دەینی وا ئەمین بەگ و گوڵخاتر بە خۆ بە بارگەو بارخانەی گاوران هاتنەوە. پاشاش بە خۆی و بە وەزیر و خزمەتکارەوە بە پیریان وە دەچن و بە یەکتر شاد دەبنەوە. ئەوجا پاشا ڕو لە وەزیری دەکاو دەڵێ چ قابیلی ئەمین بەگییە، وەزیر دەڵێ ئەتو گوڵخاترت دایێ، ئەمنیش کیژەکی زۆر جوانم هەیە ناوی گوڵبادەمە، ئەگەر ئەتو ڕازی بی ئەوە پێشکەشی دەکەم. پاشا دەڵێ هەر ئێستا بڕۆن مەلای بێنن. گوڵبادامی لە ئەمین بەگی مارە دەکەن و شایی و بەزمی دەگێرن. گوڵبادەم ئەو لاوە بوو کە ناوی خۆی نابوو لاوی نەناسراو بەرگی پیاوانی لە بەر کرد بوو کەس نەیدەزانی ئەوە کیژە .

گوڵبادەم کیژی وەزیر لە گەڵ گوڵخاتری دەستە خۆشك بوون، زۆریان یەکدی خۆش دەویست، ئەو دوو کیژە لە گەر چەند کیژی شاری خڕ دەبوونەوە و، فێربوون هەموو ئێواران دەچوون خەزێنەی ماری دەورەمەندەکیان دەدزی و، شەوان شتیان پێ دەکڕی و بەزم و ڕەزمیان پێ دەکرد، هەتا بەرە بەری بەیانیان دەچوونەوە سەر جێی خۆیان نەیان دەهێشت داك و بابیان بزانن. وەکی گاور گوڵخاتریان فڕاند کیژەکان لە خەمان گەمەو بەزمی شەوانیان ڕاگرت، کە گوڵخاتر هاتەوە دەستیان پێ کردەوە. ئەوجا نۆبەتی خەزێنەی ماری پاشای دەبێ بدزن. گوڵبادام مۆر وەکی هەبوو مێروی خەویان پێ دەگۆت، لە سەر بالیفی هەر کەسەکت دابنابا خەوی لێ دەکەوت. ئەوجا گوڵبادەم کە شەو دادەهات بەو مێروە ئەمین بەگی دەنواند، هەتا بە خۆی. بڕوا لۆ بەزمی خۆی شەوەك ئەمین بەگ وا گادێ گوڵبادەم لە سەر جێی نمایە، زۆر دەترسێ دەڵێ خوایە ئەو ژنە چی بە سەر هاتییە؟ گێی لە دەنگی دەرکەی دەبی خۆی مات دەکا. گوڵبادەم لە

سەرەخۆ دێتــەوە ناو جێ. ئەمین بەگ لە دڵی خۆی دەڵێ دەبـێ ئـەو سـڕەی تـێ بگـەم،
بزانم ئەو ژنە کێوە دەچی؟ دەنگ ناکا هەتا شەوی پاشتر. پەنجەکی خـۆی دەبـڕی هـەتا
خەوی لێ نەکەوی، کە شـەو داهـات هـەر دوکیـان دەچـنە نـاو جـێ. ئـەمین بـەگ دەڵێ
گوڵبادەم ئەو شەو زۆرم خەو دێ. گوڵبادەم دەسـتی لـە مـل دەکـا و مێروەکـەی لـە بـن
سەری دادەنێ. ئەویش چاوی خۆی لە سەر یەك دادەنێ، دیتی کە گوڵبادەم مێروی لە بن
سەری دانا لە سەرە خۆ مێروەکەی لادەبا، خەوی لێ ناکەوی. بە تی چاوی تەماشا دەکـا
بزانی ژنەکەی چ دەکا؟ گوڵبادەم جلکی مێردەکەی لەبەردەکاو، چەك و سیلاحی لە خۆی
قایم دەکاو دەڕوا، وای زانی مێردەکەی وەکی جاران خـەوی لێکەتییـە، کـە ئـەمین بـەگ
ئەوەی دیت لە دوی دەڕوا لە دەرکەی حەوشەی جلکی خزمەتکارەکی لە بەر دەکا، هـەتا
ژنەکەی نەیناسی و لە دوی ڕۆیی هەتا گەیشتە دەرکەی ئەشکەفتەکی خـۆی لـە پـەنای
ماتکرد. هەستی ڕاگرت گێی لە دەنگی کیژان بـوو بـە گوڵبادەمیـان دەگـوت: لـۆ وەهـا
دەرنگ هاتی؟ ئەویش گۆتی ئەوشەو مێردەکەم درەنگ خەوێ لێکەوت. هـەموویان لـە
ئەشکەفتێ هاتنە دەرێ بە بەرگی پیاوان و چەکدار تێکـرا ڕۆیشـتن. ئـەویش بـە دوی لـە
دوویان دەچی هەتا گەیشتنە دەرکەی ماری پاشای، دەچون خەزێنەی بدزن نۆبـەدار واگـا
هاتن بووە شەر وایان زانی دوژمن بە سەر مارێ پاشای دادایە. شیرەکیان لۆ گوڵبـادامی
ڕاوەشاند ئەمین بەگ دەستی خۆی دابەرێ و دەستی بریندار بوو. کیژەکان زۆر ئـەمین بـە
گیان ڕاکێشو بردیانە ناو ئەشکەفتێ گولبادەم دەستری خۆی لـە دەسـتی بەسـتی نـازانی
ئەوە ئەمین بەگە. ئەمین بەگ دەڕوا پێش ژنەکەی دەگاتـەوە مـارێ، دەچـیتەوەناو جێـی
خۆی مات دەکا هەتا ژنەکەی دێتەوە. کە گوڵبادەم هاتەوە ئەمین بـەگ دەسـت بـە نـارە
نارێ دەکا. گوڵبادەم دەڵێ ئەوە کێندەرت دێشی، لـۆ دەنـاڕێنی؟ ئـەوێش دەسـتی خـۆی
نیشان گوڵبادەمی دەدا، دەستری خۆی دەناسیتەوە دەزانی ئەوە ئەمین بەگ بووە لە دوی
هاتییە نەك خزمەتکار. بە مێردەکەی دەڵێ لۆ ئەوەندە دەناڕێنی ! بـەبیرت نـایێ وەکـی

سەری گاورانم دەبڕی و لە پێشم فڕێ دەدای؟ شەری گاوران زیاتر بە خۆم بووم، لۆ ئەو وەختی نارە نارت نەدەکرد، ئەمن ئەو لاوە بووم وەکی لە دو تو هاتم لۆ یارمەتیت.
ئەمین بەگ دەستی لە مل دەکاو دەرێ چما ئەتو بووی ئەو شەڕەت لە گەر من کرد؟ سەد پاڵەوانت بە قوربان بی، بەرام نابی چیدی ئەو نیشانە بکەی. ئەوجا گوڵبادەم شەرتی لە گەر مێردەکەی دەکا واز لەو نیشەی بینی بە بێ قسەی ئەمین بەگی چ نیشان نەکا .

ئەمین بەگ داوا لە پاشای خەزوری دەکا ئیزنی بدا بچیتەوە وراتی خۆیان، چەند سارە لە مارێ بابی دوور کەتیتەوە. پاشا بە خۆو وەزیر خزمەتکاران لە گەر چەند بارگەو بارخانوو سامانێکی زۆر ئەمین بەگی دەبەنەوە، بابی ئەمین بەگی لەو ڕۆژەی ئەمین بەگ ڕۆیشتبو بابی نەخۆش کەتبو لە ناو جێی. وەکی گێی لێ دەبی وا کوڕەکەی بە سەلامەتی هاتەوە بە ژن ومندارەوە لە خۆشیان هەر دەستیتەوە بە پیریان وە دەچی بە یەك شاد دەبنەوە و لە ناو شاری دەبیتە هەراو شایی لە خۆشی ئەمین بەگی دەست دەکەن بە خێرو خێرات بە سەر خەرکی دابەش دەکەن.... کراسم دڕاو چم پێ نەبرا .

# سوڵتان مەحمود و هەیاس

هەیاس کوڕەکی چاردە ساری بوو، داکی مردبوو، هەرپێیان دەگوت هەیاسە کەچەر. زڕداکی هەبوو زۆر خراپ بوو، ڕکی لە هەیاس دەبۆوە، بابی هەیاسی پیاوەکی فەقیر حار بوو، جۆتە گایەکیان هەبوو رۆژی لە گەر هەیاس دەچووە جۆتی و ئێواران نانی دەخواردو دەچووە مزگفتێ هەتا درەنگ نەدەهاتەوە. رۆژەك لە رۆژان هەیاس هەستی پێ کرد کە زڕداکی بەینی هەیە لە گەر کابرایەکی، زۆر تورە بوو. لە دری خۆی گۆتی دەبی ئەوەی ئاشکرا بکەم. کادینەکی کایان هەبوو شەوێ لە ناو کادێنی خۆی مات کرد، دیتی لە ناکاو زڕداکی پەیدا بوو، تووشی دۆستی بوو، قسەی لە گەر دەکرد، گێی لێ گرتن بزانی چ دەرێن. زڕداك بە دۆستەی دەگۆ لە کێ جۆتی دەکەی هەتا مریشکت لۆ سۆرکەمەوە لە گەر شیوێ لۆت بینم. دۆستە گۆتی: ئەو رێیەی ئەمن پێیدا دەڕۆم کای لێ رو دەکەم، هەتا دەگاتە سەر جۆتی، ئەتوش بە سەر کایەکەی داوەرە گایەکانی من یەکیان رەشە یەکیان بەرەکە. هەیاس گێی لە قسەکان بوو، پێش بەیانیان چوو لە کۆریتێ سێ هێلکەی هینا و لە پێش بابی دای نا، باب نازانی مەسەلە چییە ؟ چوو کای هینا لە رێی خۆیانی ڕوکرد، ئەو کایەی کابرا لە رێی جۆتی خۆی روی کردوو هەمووی بە گێسکی ماری، هەتا زڕداکی بە رێی هەیاسی بڕوا. هەیاس لە گەر بابی دەستیان بە جۆتێ کرد. گایەکانی وان هەردووك رەش بوون، وەختی نیوڕانی داهات هەیاس زانی زڕداکی دێ نان و شیوی دەینی، بە بابی گۆت: بابە گایەکمان نەخۆشە ئەو جەمەدانیەی خۆتم بدێ بە سەر پشتی دادەم. هەتا گایەکە لە پێش چاوی ژنەی بەرەك

دیاربی. زرداك هات بە سەر رێی هەیاسی گەیشتە سەر جۆتی خۆیان : دیتی وا مێردەکەی لە گەر هەیاسی دانیشتینە بە دیار گایەکەیان. مێردەکەی لێی پرسی ؟ ئەوە لۆ هاتی : ئەویش گۆتی : ئەوە مریشك و برنجم لێنایە لۆم هینانە. دۆستەکەش بەرامبەریان جۆتی دەکرد، ژنە لە مێردەکەی پرسی ؟ ئەوە کێیە جۆتی دەکا گۆتی: ئەوە کابرایەکی کاسبکارە. ژنە گۆتی : دەگاسی بکە با نانتان لە گەر بخۆا خێرە. بابەش بە هەیاسی گۆت : برۆ گاسی بکە. هەیاس هەرسێ هێلکەی لە پێش بابی دانا لە دویەك هەندەك لێك دوور بوون، ئەوجا چوو بە کابرای گۆت: دەزانی بابم هەستی کرد یە ئەتو بەینت هەیە لە گەر زرداکم، وا دێتە ئێرە زەینی خۆت بدێ ئەگەر بابم سێ جار خۆی شۆڕ کردەوە لۆ عاردی ئەوە مەعنای وایە سێ تەراقی دەخوا بتکوژی ... هەیاس هاتەوە کن بابی گۆتی : بابە بە خۆت هەرو بیهینە، لە گەر من نەهات. بابی هەیاسی کە هەستاوە دێتی سێ هێلکە لە عاردی کەتیە، خۆی خوار کردەوە یەکی هەرگرتەوە، دووەمی هەرگرتەوە، سێیەمی هەرگرتەوە، کابرا لە دری خۆی گۆتی : ئەوە سێ جار داهاتەوە، سێ تەراقی خوارد، بە خوای دەمکوژی، با برۆم، هەتا نەگەیشتیتە سەرم. بابی هەیاسی گاسی کرد هۆ هۆ کابرا وەرە مەرۆ ڕاوەستە. کابراش لە ترسان بە غاردان هەرات، هاواری دەکرد: بە خوای درۆیە هەرچی دەرێن درۆیە. بابی هەیاسی گەڕاوە نانەکەی خوارد، ژنەکەش چۆوە ماری. هەموو رۆژی دەهاتنە جۆتی و ئیشی خۆیان بەرێوە دەبرد رۆژەك لە رۆژان دەبینن وا لە دور چەند سوارەك دیارن، گۆتییە هەیاسی کوڕم ئەوانە چنە بەرەو ئێرە دێن؟ هەیاس گۆتی : بابە ئەوە سوڵتان مەحمودە، پیاوی بە عومر دەگرن، وەکی توو وەرە لەو کەندەی بتشارمەوە، کونە ریوەیەکی لێ بوو بابی خستە ناو کونە ریوی و بە خۆی چۆوە سەر جۆتی. سوارەکان بە غار هاتنە کن هەیاسی لێیان پرسی: ئەوە لۆ لەوکەندەی هاتیە دەرێ : گۆتی ئەو کونە ریویەکی لێیە چووم بزانم ریوەیەکە لە کونێ نەهاتیتە دەرێ؟ ئەوان تاژی و تولەیان پێ بوو، لە راوێ دەهاتنەوە.

گۆتیان: وەرە لە گەرمان دەچین ریوی لە کونی دەردەینین. تولە دەچووە ناو کونێ، کابرا بە دار جۆتی لێی دەدا .

تولە دەهاتە دەرێ هەیاس گۆتی : راوەستن ئەو ریویە بە من دەردێ هەندەك کای هینا لە کونەکەی ئاگری تێبەردا، دوکەر چووە ناو کونەکەی. بابەی قورِ بەسەر لە کونێ دەرپەرِی و گۆتی : سولتان مەحمود جاشك هەر هەلە سولتان مەحمود بە سەر سورمانەوە گۆتی : وەرە بزانم ئەو قسە مانای چییە ؟ ئەویش گۆتی : ئەو کورِەم ئەوهای فێرکردم وا برێم جاشك هەرهەلە. سولتان گەلەك پێکەنی گۆتی : ئەو کورِەی نافرۆشی ئەویش گۆتی: ئەو کورِەم ناوێ با لە کۆرم ببتەوە ئەو دەردەی بە من کرد تازە هەر کورِی من نییە. سولتان بردی کردییە قازەوان، بە رۆژ دەچووە بەر قازان، ئێواران دەچووە دیوەخانێ سولتانی تاجر لە وێ خرِ دەبونەوە هەر کەسە دورِو یاقوتی خۆی دەینا نیشان یەکیان دەدا، بزانن ئی کێ باشەو ئی کێ خراپە! کابرایەك گۆتیە ئەوانی دی ئەورۆ دورِەکی زۆر باشم پێیە، تەماشایان کرد گۆتیان دورِەکی زۆر باشە، هەیاسە تەماشای کردو گۆتی : ئەو دورِە باش نیە، کرم لێی دایە.. کابرایەکە گرانی کرِیبوو زۆر تورِەبوو. تاجر گۆتی: وەرە گرۆی بکەین، ئەگەر کرمی نەبوو دەت کوژم. هەیاس گۆتی: باشە دورِیان شکاند کرمی بوو سولتان گۆتی : نانەك و مراکە شیوەکی لۆ هەیاسی زیاد بکەن. هەیاسیش گۆتی وەعەسرەش، سولتان بەو قسەی هەیاسی زۆر بە سەر خۆی دا شکاوە و، تورِەبوو. رۆژی پاشتر کابرایەکی دی دورِی خۆی هیناو گۆتیان ئەو دورِە باش نییە، رەنگبێ کرمی بێ. هەیاس دەستی دا دورِی گۆتی: ئەو دورِە زۆر باشە کرمی نییە، دورِەکەیان شکاند قسەی هەیاس دەرچوو. سولتان گۆتی نانەکو مراکە شیوەکی لۆ هەیاسی زیادکەن. دیسان هەیاس گۆتی : وە عەسرەش... هەیاس ناوی بووە هەیاس دورِناس، زۆر قسەی دەزانی ئی کەونینە و پێشینان. سولتان مەحمود بەو قسەی هەیاس زۆر پەست دەبوو وەکی چۆوە مارێ خۆی لە داکی تورِە کرد پێی گۆت: وەرە پێم برێ بابی من کێیە ؟

داکی گۆتی : ئەو قسانە چییە دەکەی لۆ بابی خۆت ناناسی کێیە ؟ شیری دەرهینا گۆتییە داکی سەرت دەبڕم، ئەویش ترسا گۆتی : کوڕم ئەتوم لە خزمەتکارەکی خۆمان بووە، مێردەکەم چووە غەزایی و سارەکی پێ چوو، کە هاتەوە ئەتوم ببوو. پێم گۆت : وەکی ئەتوش رۆیشتی ئەمن زگم مانگەك بوو، ئەویش بڕوای کرد. سولتان مەحمود زۆری پێ ناخۆش بوو. هەیاس زانی کە سولتان مەحمود تێگەیشتییە بیژیە. سولتان لە دری خۆی دا گۆتی : دەبی هەیاس شەرمەزاری خۆم بکەم. سولتان ئەمرەکی دەرکرد گۆتی وەزیرو خزمەتکاران خۆتان حازر بکەن دەچینە ڕاوێ، حەفت رۆژمان پێ دەچی. ئەوانیش خۆیان رێکخست نان و ئاویان لە گەر خۆیان بردو رۆیشتن. هەیاسیش لە گەریان چوو، ئەو چونکە بێ کەس بوو ماریَ سولتانی بە خێویان دەکرد، نان و ئاوی پێ نەبوو. سولتان بە هەموانی گۆتبو نان و ئاوی نەدەنە هەیاسی. هەیاس زۆری تینیبوو چووە کن هەریەکەکیان داوای ئاوی کرد، کەس ئاوی نەدایێ. چووە کن سولتانی گۆتی : کەس ئاوم ناداتێ، پێیان بریَ قومە ئاوەکم بدەنێ. سولتان گۆتی وەرە لە گەرم بچینە ئەو پەنا بەردەی، دوو پەنجەم لۆ بگەینە بەردی، لۆی داهاتەوە ئەوجا سولتان ئاوی دایێ. سولتان دری داکەت، بە هەموانی گۆت : با بگەرێینەوە ڕاومان تەواو بوو، با لۆ رۆژەکی دی بی. بەرام هەیاس نەچۆوە لە گەریان رۆیشت، خۆی بزر کرد. چووە کن قەسابەکی پێی گۆت پیستە بزنەکم بدێ، قەسابەکە پیستە بزنەکی دایێ و، هەیاس پیستەی وەرگرت، چووە دوکانی لەوێش بیست سی دنکە زەنگورەی کڕی. هەموی بە پیستەکەی وەکرد. هەیاس دەیزانی سولتان چ وەخت دەچیتە حەمامێ، ئەو حەمامەی لۆ سولتانی حازر کرابوو، چووە وێ. بە حەمامچیەکەی گۆت: دێم خۆم دەشۆم ئەویش گۆتی نابی.، چونکە سولتان دێ خۆی دەشوا، نابی کەس لە پێش وی بێتە ژۆرێ. هەیاس گۆتی: سولتان چەندت دەداتێ؟ حەمامچی گۆتی ٥ لیرەم دەداتێ ، هەیاس گۆتی ئەمن ١٠ لیرەت دەدەمێ. ئەوەندەیە نیزنم بدە پێش سولتانی بچمە ژۆری خۆم بشۆم، حەمامچی

سەلماندی و نیزنی دا ... بەرە بەری بەیانیان بوو وەختی سولّتانی بوو بێ لۆ حەمامێ. هەیاس زوو چووە ژۆری حەمامەکە لە پەنای حەوزی حەمام خۆی ماتکرد. سولّتان هاتە ژۆرێ و خۆی روت کردەوە، لۆ ناو حەوزێ چوو هەیاس پیستە بزنەکەی بە سەر سەری خۆی داداو لۆی چوو، خۆی هاویشتە سەر ملی سولّتانی زرە زرەی زەنگوران زراوی سولّتانی برد. سولّتان زمانی پەلّت بوو شێوا، خەریك بوو دری لە خۆ ببتەوە. بە پلتە پەلّت دەی گۆ ئەتو چی؟ ئەویش گۆتی: ئەمن عزرائیلم، هاتیمە روحت بکێشم. بە ترس و لەرز لێی پاڕاوە داکت چاك بابت چاك ئەمن سولّتان پاشامە وەسیەتم هەیە، جارێ لێم گەرێ هەتا دوو سێ رۆژی دی. هەیاس گۆتی : باشە، رۆیشت بە جێی هێشت. سولّتان لە ناو حەمامێ بەربۆوە بێ هۆش کەت. حەمامچی گۆتی : ئەوە لۆ سولّتان نەهاتە دەرێ؟ وەکی دەچی دەبینی سولّتان وا لەو گۆڕەی کەتییە خەبەری نارد لۆ ماریێ بێن سولّتانی ببەنەوە. وەللاّ هەمویان بە وەزیر و خزم و کەسەوە هاتن سولّتانیان بردەوە. خەرکی شاری دۆست و برادەر خڕ بوونەوە و، دەورەیان لێدا ئەوجا روی لە وەزیری کرد، گۆتی : با وەسیەتتان لۆ بکەم، چونکە ئەمن سێ رۆژم مایە دەمرم. ئەوانێش گۆتیان ئەتو کو دەزانی ؟ سولّتان گۆتی : عزرایل بە خۆی پێی گۆتم. وەسیەتی تەواو کردو سێ رۆژەکە تەواو بوو سولّتان نەمرد. مانگەکی پێ چوو ئەوجا سولّتان هاتەوە سەرەخۆ وەکی جاران هەر ئیشەکی دەیکرد ئیشەکەی نەدەرۆیی، چونکە هەیاسی لە کن نەمابوو زۆر خەفەتی دەخوارد لۆ هەیاسی ... هەیاس چووە گوندەکی دوور لە کن ئاشەوانەکی بووە شاگرد، رۆژەك سولّتان وەزیرو پیاو ماقولەکانی هەموو گاسکرد پێی گۆتن : دەبی ئەنگۆ تەگبیرەکی بکەن هەیاس لۆ من بێنەوە. ئەوانیش گۆتیان: هەیاسە لە شاری نمایە، دەبی لە گوندەکی خۆی شاردبیتەوە. یەك تەگبیر هەیە لۆت بکەین، ئەویش ئەوەیە: دەبی ئەتو لە چەند گوندان گیسکەکی بنێرە کن ئاغای و تەسلیمی بکە. پێی برێ ئەو گیسکەم لۆ بە خێو بکەن سێ مانگان بەرام بە شەرتەکی کێشی گیسکەکەی چەندە و

چەند کیلۆیە دەبی هەر وەکی خۆی بمینێتەوە. نەزیاد بکاو نەکەم. سولـتان ئـەو قسـەی پیێ خۆش بوو. سولتان ۱۰ گیسکی نارده کن ئاغەی ۱۰ گوندان ئەو قسانەی پێ گـۆتن : گۆتی پاش سـێ مـانگی دێمـەوە، دەیانبەمـەوە پیـاو مـاقولان گۆتیـان: ئـەوها نـەبی هەیاس نابیندرێتەوە. چونکە ئەو ئیشـە بـە هەیاسـی دەکـرێ. ئـەو ئاشـەوانەی هـەیاس شاگردی بوو ئاشەوانی ماری ئاغەی بوو، ئێواران دەچووه دیوەخانی ماری ئاغەی. دیتی ئاغا زۆر عێدزه، ئاشەوان لێی پرسی ئاغەم لۆ وها عێدزی؟ ئەویش گۆتی : وەللا چ برێم سولتان بارەکی زۆر گرانی هاویشینه سەرێ، دەرێ دەبی ئەو گیسکەم لۆ بـە خێـو بکـەن هەتا سێ مانگان کێشی وەکی خۆی بمینێتەوە. ئاشەوان چۆوه ماری ئەو قسـەی ئاغـەی گێراوە لۆ هەیاسی. هەیاس گۆتی : برۆ به ئاغەی برێ ئەمن لۆی بـە خێـو دەکـەم، بـەو شەرتەی دوو فەرخە گورگم لۆ بینی لە گەر گیسکەکەی. ئاغە ئەو قسەی پێ خۆش بوو، زۆری پێ ئاسان بوو. ناردی له چیای دوو فەرخە گورگیان لۆ گرت هینایان دایانە دەست شـاگردی ئاشـەوان. هـەیاس ددانـی هـەردوو فەرخـە گـورگی دەرهینـا، گیسکەکەشـی خزمەتدەکردو بـەخێوی کـرد گێسـك قـەرەو ببـوو. ئـەوجا گورگـەکانی لـە گیسـکەکەی بەردەدا بە هەردووکیان گیسـکەکەیان دەشـێلا هـەتا مانـدی دەبـوون و، ددانیـان نـەبوو قەمپاری لێ بدەن. گیسکەش لە ترسان گۆشتی بـەردەدا هـەتا سـێ مـانگ تـەواو بـوو هەیاس ئەوهای بەخێۆ کرد. ئەوجا سولتان وەزیری نارد کە گیسکەکانی بینیتەوە، گوند بە گوند گەڕان گیسکەکانیان دەکێشا هەموویان زیادیان کـرد بـوو. تـەنیا ئـەو گونـدەی هەیاسی لێ بوو گیسکەکە وەکی خۆی بوو، نەزیادی کردبوو نە کـەم. ئـەوجا خەبـەر لـۆ سولتانی چوو پێیان گۆت: ئی گوندی جوامێراغە گیسکەکە وەکی خۆی مایتەوە، ئەوانی دی چەند کیلۆیەکیان زیاد کردیە. سولتان ناردی جوامێراغە بێتە ئێرە. ئەوێش چووه کن سولتانی گۆتی : فەرموو چ ئیشەکت هەیە؟ سولتان لە ئاغەی پرسی کێ ئـەو گیسـکەی بـە خێـو کردییـە ؟ ئاغـە گـۆتی : شـاگردی ئاشـەوانەکەم بـە خێـوی کردییـە. سـولتان

خەراتەکی باشی دا ئاغەی. ئەوجا گۆتی: ئەو شاگردە لۆ من باشە. وەزیری سولتانی بە سواری چوو هەیاسی هیناو، زۆر بە ڕێك وپێکی بە پیری وە چوون لە جاران زیاتر قەدریان گرت. بەینەکی پێ چوو سولتان گۆتی نانەکو مراکە شیوەکی لۆ هەیاسی زیاد بکەن. هەیاس گۆتی: وەعەسرەش سولتان گۆتی : لە سایەی سەنگ هەیاس گۆتی : حەمامی بە زەبرو زەنگ سولتان تێ گەیشت کە هەیاس بوو لە حەمامێ خۆی کردبووە عزرایل، بە هەیاسی گۆت نەئەمن دەنگ نە ئەتو دەنگ ... کراسم دڕا چم پێ نەبڕا .

خوێنەری هێژا و خۆشەویست بە پێویستم زانی ئەو چیرۆکانەتان پێش کەش بکەم و بیخەمە بەر دەستتان بۆ ئەوەی فۆلکلۆری گەلەکەمان لە بیر نەکرێ هیوادارم بە دڵتان بێ و بە خزمەتێکی بچوکم لێ وەربگرن .
لە بەر ئەوەی ناوی ( شەوانی دوگردکان ) م هەلبژارد چونکە لە دوگردکانی گوند خۆشەویستەکەمان ئەو چیرۆکانەم گوێ لێ بووە، لە شەوانی زستانان بە تایبەتی لە شەوی شەواران هەر لەو ێش لە ساڵێ (١٩٦٢) دەستم کرد بە نووسینی ئەو چیرۆکانە .
لە (١٩٨٧/١/١ ) شەوی دووشەمە کات یەکی شەو دوبارە نوسیمەوە لە (١٩٨٨/١/١) شەوی دووشەمە کات سێ و نیوی شەو کۆتاییم بە نووسینی ئەم بەرهەمە هێنا .
( قاقۆڵ زێرو زیو — ئەمین بەگ ) ئەو دوو چیرۆکە خوا لێ خۆش بوو دایکی خۆشەویستم کە منداڵ بووین شەوی زستانان لە گەڵ خوشك و برایەکانم کۆ دەبوینەوە و بۆی دەگێڕاینەوە .
( گێ کەرە — حەمبەروچك — دەنکە هەنارە) پوری خۆشەویست قەدریە خان بۆی گێڕاینەوە لە دوگردکان .
( مام پیربار - لاچەقینگرە ) خوا لێ خۆش بوو مام حەسەن چار کلدان خەلکی دوگردکانە لە کاتی شەواران بۆی گێڕاینەوە .
( پاشا و دەوریش ) مەلا عومەلار کە بە کۆرە بە ناوبانگە بوو هەردوو چاوی کوێر بوو خەلکی دوگردکان و هەر لە لای خۆمان بوو چیرۆکی زۆر خۆشی دەزانی شەوانی زستان بۆی دەگێڕاینەوە .
( کوتە مەڕ) خوا لێ خۆش بو خالە مەحمود محەمەد دزەیی بۆی گێڕاینەوە .
( گورو سنۆبەر — سوڵتان مەحمود — هەیاسە کەچەرو تاجرو جولەکە ) خوا لێ خۆش بوو مامە سابیر عەزیز دزەیی بۆ گێڕاینەوە .

# فەرهەنگۆك

## پیتی أ

ئەوشۆ : ئەم شەو

ئەمە : ئێمە

ئەتو : ئەتۆ — تۆ

ئەنگۆ : ئێوە

ئەوجا : ئینجا

## پیتی ب

برندی کرد : بەرزی کرد

برند : بڵند ، بەرز

برێ : بڵێ

بوسرمان : موسڵمان

بەعاستەم : بە ناستەم ، بە حاڵ

باغەر : باخەڵ

**پیتی پ**

پیَ ی گۆ : پێی گۆت، پێی وت

پلکیَ : پوریَ ، پلە

پلك : پور

**پیتی ت**

تاژی : تانجی

تەپلَ : تەپر

**پیتی ج**

جاحێر : جحێلَ ، گەنج

جارەك : جارێك

جارەکی دی : جارێکی تر

چت دەویَ : چیت پێوستە

چت لۆ بینم : چیت بۆ بێنم

**پیتی ح**

حازر : ئامادە

حازربوون : ئامادە بوون

حوشتر : وشتر

پیتی خ

خەرك : خەڵك

خڕی كردەوە : كۆی كردەوە

خانیەكە : خانووەكە

خەیار : خەیاڵ ، ئەندێشە

خین : خوێن

پیتی د

دەیەوێ : ویستی ، دەیویست

دەوعای كرد : داوای كرد

دەرێ : دەڵێ

داك : دایك

در : دڵ

دەركە : دەرگا

دەیناراند : دەیناڵاند ناڵە ناڵیەتی

دەستی لە چۆكی دەرینایە : دەستی لە ئەژنۆدایە

پیتی ڕ

ڕەشمار : رەشماڵ

رۆژهەرات : رۆژهەلات

**پیتی ز**

زگ : سک

**پیتی ژ**

ژنەك : ژنێك

ژنەکی دی : ژنێکی تر

**پیتی س**

سارەك : ساڵێك

سار : ساڵ

ساحێب : خاوەن

سوند : سوێند

**پیتی ش**

شێلو : شلوێ: لێڵ

شوون هەرگر : شوێن جێ پێی کەسێك

شارەك : شارێك

شیر : شمشێر

**پیتی ع**

عێدز : عادز ، مات و مەلول

پیتی ق

قرار : بڕیار

قراریان دا : بڕیاریان دا

قوتار بوو : رزگار بوو

قاقۆل : کاکۆل ، پەرچەم

قاسید : نێنەر

قافره : قافیله ، کاروان

پیتی ك

کۆمەر : کۆمەڵ

کەور : کەوڵ، پێستە

کوو : چۆن

کووی : چۆنی

کەلەش : لاشە

پیتی گ

گێم : گوێم

گێ : گوێ

گیز : گوێز

گاس : بانگ ، بانگی کرد

گۆتی : وتی ، گوتی

گۆتیان : وتیان

گوجیله: توله : توتکه سەگ

گور : گوڵ

گوریس : پەت

گچکە : بچوك

گاڕان : گاگەل

پیتی ل

لینگە پێراو : تاکە پێڵاو

لە کێندەر : لە کوێ

لەکن : لە لای

لۆیێ ، لۆ : بۆیە ، بۆ

لەکنە من بە : لە لای من بێنەوە

لەدوم هاتینە : هاتوون بە شوێنما

پیتی م

مندار : منداڵ

مارێ : ماڵێ ، ماڵەوە

مار : ماڵ

مامز : ئاسك ، ئاهۆ

مارێ مە : ماڵی ئێمە

مێروستان : مێرولە

مارو مرك : ماڵ و سامان

پیتی ن

نەقوستان : کەم و کوڕی

**پیتی ه**

هەرێ : غاردە ، ڕاکە

هەرۆ : بڕۆ ، بچۆ

هەوکە : ئێستاکە ، هەنوکە

**پیتی و**

وەکی : وەکو

وراغ : ولاخ